


# پرشنگی رۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری

دانەر
مەلا حسێن شێخ سعدی

ئامادەکردنی بۆ چاپ
بشیر حسێن سعدی
جێگری داواکاری گشتی

لەساڵی ١٩٥٢ داندراوە

بەرگی هەشتەم

# پرشنگی رۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری


دانەر

**مەلا حسێن شێخ سعدی**



ئامادەکردنی بۆ چاپ

**بشیر حسێن سعدی**

جێگری داواکاری گشتی


لەساڵی ١٩٥٢ داندراوە

**بەرگی هەشتەم**




ناوی کتێب : پرشنگی رۆژی کوردەواری لە شەرحی بوخاری

ئامادەکردنی بۆ چاپ : بشیر حسێن سعدی.

بەرگی : هەشتەم

ساڵی چاپ : ١٤٢٣ك - ٢٠٠٢ز

کۆمپیوتەر : نووسینگەی تەفسیر.

ئەرکی چاپ: نووسینگەی تفسیر .

چاپ کردنی : ئۆفسێتی هەولێر .

ژمارەی سپاردن : ٢٣٨ لە ساڵی ٢٠٠١ .



وێنەی دانەر
مەلا حسین شێخ سەعدی
١٩٨٣-١٨٨٣

## مێژووی ژیانی دانەرو داندراوەکانی لەچەند دێرێکدا

## ١٩٨٣-١٨٨٣

ناوی تەواوی مەلا حسین شیخ سەعدی فەیزوللایە نازناوی لەئەدەب (فانی)یە وە لەهەندێ هەلبەستی نازناوی (کاکە)ی هەڵبژاردووە. بەرەچەڵەک لەعەشیرەتی بلباسە لەتیرەی (بەرچەم) لەساڵی ١٨٨٣ لەشاری هەولێر هاتوتە دونیاوە لەتەمەنی شەش ساڵیدا لەبەر خوێندن داندراوە لەمزگەوتی گەورەی هەولێر کە ناسراوە بە مزگەوتی بازار پاشان لەزۆر جێگا گەڕاوە بۆ خوێندن لای مەلا ناودارەکانی ئەوکاتە وەکو مەلا عبداللەی جەلی زادەو مەلا صادق لە مزگەوتی شێخ جامی لەشاری کۆیێ و لای مەلا ئەحمەدی سکتان و اجازەی مەلایەتیشی لەهەولێر لای مەلا ابو بکر عمر افندی وەرگرتووە کە ناسراوە بە (مەلا فەندی).

بۆ یەکەم جار لەگوندی قەپلان بوەتە مەلا پاشان چووە گوندی سیاوو خورمەڵەو سوریژەو دووگردکان لەساڵی ١٩٤٧ لە دووگردکانەوە هاتە هەولێر بوو بە مەلای مزگەوتی -دارتاشان-.

لەماوەی ژیانیدا هەروەکو خۆی دەی فەرموو (٣٠) سی ساڵ هەر خەریکی خوێندن بووە و (٢٤) بیستو چوار ساڵیش دەرسی بە فەقێیان گوتووە لەو گوندانەی باسی کراو وە هەر خەریکی دانانی پەرتووکی ئایینی و دانانی هەڵبەست بووە، ئەوا لەخوارەوەش داندراوەکانتان بۆ باس دەکەین.

١- ژیانی ئنسان تەفسیری قورئان کە شەش بەرگە وە هەموو بەرگەکانی بلاْوکراوەتەوە ئەو پەرتووکەی لەساڵی ١٩٣٠ داناوە بەیەکەم تەرجەمەو تەفسیری قورئانی پیروز دادەندرێ لە کوردیدا. وە لەلایەن زۆربەی مەلایانی کاتی خۆی پەسندکراوە.

٢- پرشنگی رۆژی کوردەواری لەشەرحی بوخاری کە ئەوەشیان دەبەرگە ئەوەی بەردەستتان بەرگی هەشتەمە لەم پەرتووکە کە شەرحی حەدیثەکانی بوخاریە بەکوردی.

٣- دیوانی هەڵبەست بەناوی (دیوانی فانی) لەساڵی ١٩٨٤ بلاْوکراوەتەوە.

٤- تەرجەمەی قەصیدەی بوردیە بەکوردی لەسەر هەمان کێش و سەروا لەساڵی ١٩٨٥ بلاوکرایەوە ئەو پەرتووکانەی سەرەوەم هەموو بەچاپ گەیاندووە ئەو پەرتوکانەی کە هێشتا بەچاپ نەگەینراون ئەمانەی خوارەوەن:

١- حقائق الخیام: تەرجەمەی شیعرەکانی (خەیام)ە بەزمانی عەرەبی.

٢- شەرحی جامع الصغیر بەکوردی کە سێ بەرگە.

٣- شەرحی ذات الشفا بەکوردی.

٤- شەریعەتی ئیسلام لەچوار مەزهەب.

٥- شەرحی لەمعات بەعەرەبی.

٦- المنظوم فی العقود کە بریتی‌یە لە (٧٨٧) دێر هەڵبەست بە زمانی عەرەبی کە باسی فقهی شافعی دەکا.

٧- رازەکانی قورئان (اسرار القران) بەکوردی

وە لەبەرواری ١٩٨٣/١٢/١١ لەشاری هەولێر ئەو زانایە کۆچی دوایی کرد.

**بشیر حسین**

**هەولێر ٢٠٠١**

٨٨٧: عَنْ إبْنِ عَمْرٍو (ض) بَلِّغوا عَنّي وَلَوْ ايَةً. وَحَدِّ ثواعَنْ بَني إسرائيلَ وَلا حَرَجَ. وَمَنْ كَذَبَ عليَّ متعَمِّداً فلْيَتَبوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النّارِ.

## تەرجەمە

٨٨٧: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕ عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوالی لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی لەمنەوە بە خەلقی بگەیێن با ئایەتێکیش بی لەقورئان یا بەواتای پێشانەیەکی دیاریش بێ. و باسیش لەئەحوالی سەیری بەنی ئیسرائیل بکەن با دەرحەق بەو قومەتەش نامکن بی- واتا نەیەتە کردن- لەو شتانەی کە ئێوە زانیاریتان پێ هەیە وەکوو هاتنەخوارەوەی ئاگر لەئاسمان بۆ قوربانی خواردن هیچ زیانێکی نی‌یە. (چونکی پێغەمبەر (د) لەپێش چەسپانی پایەکانی ئاینی ئیسلام و ئەحکامەکانی ئایین نەهی لێ کردن و قەدەغەی کرد کە هیچ لەوان وەرنەگرن وە تەماشای کتابیشیان مەکەن لەترسی فتنەو امتحان)وە هەر کەسێکیش بەقەصدی درۆیەک نسبەت وەبال من بدا بەم تەرزە بلێ پێغەمبەر وای فەرمووە یا وای کردووە لەسەر پێچەوانەی ڕاستی با جێگای خۆی سازبدا لەئاگر یەعنی موستەحەقی ئاگر دەبێ.
(ش) : بەڵام ئەگەر زانایەک قسەیەک لەپێغەمبەر بگێڕێتەوە بەووشەیەکی تر بەڵام هەمەعنادا یەک بن دروستە لای زانایانی لێکۆڵەرەوە هەروەکوو لەجێگای خۆی باسی لێ کراوە.

٨٨٨: عَن أبي هُرَيْرَةَ (ض) إِنَّ اليهودَ والنَّصارى لايَصْبِغونَ فخالِفوهُم.

## تەرجەمە

٨٨٨: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی جوولەکەو دیان سەرو ڕیشی سپی‌یان ڕەنگ ناکەن. ئنجا ئێوە مرخالەفەی ئەوان بکەن (واتە بەپێچەوانەی ئەوان بجوولێنەوە) یەعنی ئێوە ڕەنگ بکەن بەغەیری ڕەنگی ڕەش چونکی لەحەدیثی جابر لە مسلم واردبووە (غيّرو وجنّبوه السَّوادَ) بەڵام بۆ موجاهید -واتە شەڕکەر لەڕێگەی خودا بەڕەنگی ڕەشیش دروستە بە اتفاق.

٨٨٩: عَن جندُبْ ابنِ عبدالله (ض) كـانَ فيمَنْ كانَ قبلكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجزِعَ فاخَذَ سكيّناً فحزَّ بِها يَدَهُ فمارَ قاءَ الدَّمُ حتّى ماتَ قالَ اللّهُ تَعالى بادَرَني عَبْدي بنفسِهِ حَرَّمْتُ عليهِ الجَنَّةَ.

**تەرجەمە**

٨٨٩: دەگێرنەوە لەجوندوبی کوڕی عبداللە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی پیاوێک لەعالەمی پێش ئێوە برینێکی لێ هەبوو لەبەر ئازاری برینەکە قەراری نەبوو ئنجا بەگێردێک دەستی خۆی بری (بێ جوداکردنەوە لەخۆی) خوێنی ڕانەوەستا هەتا مرد خودای گەورە فەرمووی بەندەی من پەلەی مردنی کرد بەهەشتم لێ حەرام کرد (چونکی کوشتنی خۆی بەحەلال دانا).

(ش) ئەم حەدیثە بناغەیەکی گەورەیە بۆ بەگەورە زانینی ئەوەی کەسێک کە خۆی بکوژێ یا کەسێکی تر بکوژێ چونکی نەفسی خۆشی ملکی خۆی نی‌یە بەهەودسی خۆی کاری تێ بکا یا لەناوی ببا.

## حديث الأبرص والأقرع والأعمى
## باسی پیسک و کەچەل و کوێرە

٨٩٠: عَن اَبي هُرَيْرَةَ اِنَّ ثلاثَةً في بني إسرائيلَ اَبْرَصَ وَأعمى وأقرَعَ: بدا لِلّهِ عزَّ وَجَلَّ اَن يَبْتَلِيَهُمْ فَبَعَثَ إليهمْ مَلَكاً فأتى الابْرَصَ فقالَ ايُّ شَيْءٍ اَحَبُّ اِلَيْكَ قالَ لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ قد قذَرَني النّاسُ قالَ فَمسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ فاعطِي لوناً حسناً وجلداً حسناً فقالَ أيّ المال اَحَبُّ اِلَيك. قالَ الأبلُ اَوْ قالَ البَقَرُ فأعطِيَ ناقةً عشراءَ. فقالَ يبارِكُ لكَ فيها. وَاَتى الأقرَعَ فقالَ أيُّ شيءٍ أحَبُّ اِلَيْكَ قالَ شَعَرٌ حَسَنٌ ويَذْهَبُ عَني هذا قَذَرَني الناسُ قالَ فمَسَحَهُ فَذَهَبَ وأعطِيَ شعراً حسناً قالَ فأيّ المالِ أحَبُّ اِلَيْكَ قالَ البَقَرُ قالَ فاعطاهُ بَقَرَةً حاملاً. وأتى الأعمى. فقالَ أيُّ شيءٍ اَحَبُّ اِلَيْكَ قالَ يَرِدُّ اللّهُ اِلَيَّ بَصَرِي فأُبصِرُ بِهِ النّاسَ قالَ فَمَسحَهُ فَرَدَّ اللّهُ لهُ بَصَرَهُ. قالَ فأيّ المالِ اَحَبُّ اِلَيْكَ قالَ الغَنَمُ فاعطاه شاةً والِداً. فأنتجَ هذانِ وَ وَلَّدا هذا فكانَ لهذا وادٍ مِنَ الأبلِ ولهذا وادٍ مِنَ البَقَرِ ولهذا وادٍ مِنَ الغَنَم. ثمَّ اِنَّهُ أتى الابْرَصَ في صورتِهِ وَهَيئَتِهِ فقالَ رَجُلٌ مسكنٌ تقطَّعَتْ بِهِ الحالُ في سَفَري فلا بلاغَ اليَوْمَ الاّ باللّه ثمَّ بِكَ اَسْأَلُكَ بالّذي اَعْطاكَ اللّوْنَ الحَسنَ والجِلْدَ الحَسَنَ وَالمالَ بَعيراً اتبلغُ عَلَيْهِ في سَفَري فقالَ لَهُ اِن الحقوقَ كثيرَةٌ فقالَ له كأني اعرفُكَ الم تكنْ ابْرَصَ يقذرُكَ الناسُ فقيراً. فأعطاكَ اللّهُ فقالَ لقد وَرِثْتُ لكابرٍ عَنْ كابرٍ فقالَ اِن كُنْتَ كاذباً فصيَّرَكَ الله الى ماكُنْتَ وَاَتى الأقرَعَ في صورتِهِ وهيئتِهِ فقالَ له مثلما قالَ لهذا فَرَدَّ عَليهِ مثل ماردَّ عَلَيْهِ فقالَ اِن كنتَ كاذباً فصيَّرك اللّهُ الى ماكنتَ وَاَتى الأعمى في صورتِهِ فقال رَجُلٌ

مسكينٌ وابنُ سبيلٍ وتَقَطَّعت بِهِ الحيالَ في سَفَري فَلا بلاغَ اليومَ إلاّ باللّهِ ثمّ بكَ نسألُكَ بالّذي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شاةً اتبلّغُ بها في سَفَري فقالَ قدْ كنتُ أعمى فرَدَّ اللّهُ بَصَري وفقيراً فقد أغناني فَخُذْ ماشيئتَ فواللّهِ لا اجْهَدُكَ اليَوْمَ بشيءٍ أخَذْتَهُ لِلّهِ فقالَ نسِكْ مالَكَ فأنما ابتليتُمْ فَقَدْ رضيَ اللّهُ عَنْكَ وسخِطَ على صاحبَيْكَ.

## تەرجەمە

٨٩٠: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) فەرمووی سێ کەس لەنەوەی ئیسرائیل یەکی‌یان بەڵەک و پیسک بوو یەکی‌یان کوێر بوو یەکی‌یان کەچەڵ بوو. خودای گەورە ئیرادەی کورد تاقی‌یان بکاتەوە. یەکێکی لە فریشتە (مەلائکە) ناردە لایان پێشیان هاتە لای پیسکەکە پێ‌ی گوت تۆ چیت لەهەموو شتێک پێ خۆشترە گوتی ڕەنگێکی جوان و بیستەیەکی جوان بێ‌شک خەلکی بێزم لێ دەکەن ئنجا دەستێکی بەسەردا هینا هیچ پیسکی نەما خودا ڕەنگێکی جوان و پیستەیەکی جوانی پێدا. پاشان پێ‌ی گوت لەمالی دونیا تو چیت لەهەموو شتێک پێ خۆشترە گوتی ووشتر ووشترێکی اوسی زگ دەمانگی پێدا گوتی خودا خێرو بەرەکەتێکی زۆری دەخاتێ. هاتە لای کەچەڵ پێ‌ی گوت تۆچیت لەهەموو شتێک پێ خۆشترە. گوتی پرچێکی جوان ئەم کەچەلیەم بڕوا خەلکی بێزم لێ دەکەن دەستێکی بەسەر ئەویشدا هینا پرچێکی جوانی لەسەری شین بوو هیچ کەچەلی نەما گوتی لەمالی دونیا چیت لا شیرینترە گوتی مانگا. مانگایەکی ئاوسیشی پێدا گوتی بۆت بەخێرو بەرەکەت دەبێ. هاتە لای کوێرە پێ‌گوت چیت لەهەموو شتێک پێ خۆشترە گوتی خودا چاووم پێ بداتەوە خەلکی پێ ببینم پێغەمبەر فەرمووی دەستێکی بەسەری ئەویشدا هینا خودا چاوی پێداوە پێ‌ی گوت لەمالی دونیا چیت لە هەموو شتێک پێ خۆشترە گوتی مەڕ مەڕێکی بەبەرخی پێ دا کەچەڵ و پیسک ووشترو ڕەشەوولاغیان زۆر بوو بێچوویان دا کوێرەش مەڕەکەی دەستی بەزان کرد. هەتا وای لێ هات پیسک شیوێکی پر لەووشتر بوو کەچەلیش شیوێکی پڕ لە ڕەشەوولاغ بوو کوێرەش شیوێکی پڕ لەمەڕ بوو پاشان قاصد (نیردراو)ەکەی خودا کە پێشان چووبووە لایان لەسەر شکلو صورەتی پێشوو چووە لای پیسکەکە گوتی من پیاوێکی هەژارم هۆیەکانی سەفەرم لەدەست پچڕاوە پێ بگەمەوە نیشتمانی خۆم هیچ کەسیش شک نابەم خودا نەبێ کە بگەمە ئامانجی خۆم دووەم کەس ئەتوو ڕجات لێ دەکەم بەو کەسەی ئەم ڕەنگە جوانەو پیستە جوانەو ئەو حالەی بەتۆ بەخشی ووشترێکم پێ بدەی پێ بگەمەوە نیشتمانی خۆم لەم سەفەرە بەلکی لەم غەریبایەتیە ڕزگارم دەبێ. پیسک

گوتی (پێ ناوەستم هەر دەرۆزەکەرێک بێ شتێکی پێ بدەم) مەلائیکەکە گوتی لام وابێ من تۆ دەناسمەوە. تۆ ئەو پیسکە نەبووی عالەم بێزی لێ دەکردی. هەژارێک بووی پاشان خودا ئەم ڕەنگە جوانەو ماڵەی بەتۆ بەخشی. گوتی ئەم ماڵە ماڵی باب و باپیری خۆم بووە بەمیرات بۆمن ماوەتەوە فریشتە گوتی ئەگەر تۆ لەم قسەیە درۆزن بی خودا بتخاتەوە سەر حاڵەتی پێشووت. هاتە لای کەچەڵیش لەسەر شکلو وێنەی پێشوو ڕجاشی لەئەو کرد وەکوو پیسک شتێکی پێ بدا کەچەڵیش وەکوو پیسک وەڵامی دایەوە هیچی پێ نەدا. بەویشی گوت ئەگەر تۆ درۆزن بی خودا بتخاتەوە سەر حاڵەتی پێشووت. هاتە لای کوێرە گوتی من پیاوێکم هەژارم ڕێبوارم هۆیەکانی سەفەرم لەدەست پچراوە. یەکەم جار خودا دووەم ئەتوو ئەتووش نەبی کەس نی‌یە بم گەیێنێتە ئامانج. ڕجات لێ دەکەم بەو کەسەی چاوی بەتۆ بەخشی‌یەوە مەڕێکم پێ بدە پێ بگەمەوە نیشتمانی خۆم. کوێرە گوتی من کوێر بووم خودا چاوی بەمن بەخشی‌یەوە. هەژاربووم خودا منی دەوڵەمەند کرد ئنجا هەرچی تۆ دەی بەی بیبە بەحەقی خودا دەستت ناگێڕمەوە لەهەرچی تۆ دەی بەی. ئنجا مەلائکە بێی گوت بۆ خۆت چاوەدێری ماڵی خۆت بکە بەڕاستی ئێوە تاقی کرانەوە بێ گومان خودا لەتۆ ڕازی بوو ڕقیشی لە ڕەفیقەکانت بۆوە.

**٨٩١: عَن اَبي سعيدٍ (ض) كانَ في بني اِسرائيلَ رَجُلٌ قَتَلَ تِسعَةَ وتسعينَ إنساناً ثم خرجَ يَسْئَلُ فأتى راهِباً فساله فقالَ لَهُ هَلْ مِنْ تَوْبَةٍ. قالَ لا فقَتَلَهُ فجَعَلَ يَسئَلُ فقالَ لَهُ رَجُلٌ أئتِ قَريَةَ كذا وكذا فادرَكَهُ الموتُ فناءَ بصَدْرِ نحوَها فاختصَمتُ فيهِ مَلائِكةُ الرَّحمَةِ ومَلائِكَةُ العذابَ فأوحى اللّهُ الى هذه اَنْ تقَرَّبي وأوْحي اِلى هذه اَنْ تباعَدي وقالَ قيسوا مابينَهُما فوُجدَ الى هذه اَقْرَبَ بِشِبرٍ فغُفِرَ لَهُ.**

### تەرجەمە

٨٩١: دەگێڕنەوە لە ئەبوو سەعید ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی لەنەوەی ئیسرائیل پیاوێک هەبوو نەوەدو نۆ کەسی کوشتبوو بەزوڵم لەپاشان چووە دەر بۆ پرسیار لەئەحوالی گوناهی زۆری هەتا هاتەلای ڕەبەنی دێرێ (راهب) پرسیاری لێ کرد گوتی من نەوەدو نۆ کەسم کوشتووە ئایا تۆبەکردن بۆمن هەیە؟ گوتی (نا) راهبەکەشی کوشت. بوو بە سەد کەس ژمارەی ئەو کەسانەی ئەو کوشتی. پاشان لەغەمی ئەم سەد کوژراوە هەر دەگەڕا بۆ پرسیار هەتا گەیشتە ڕاهبێک پرسیاری لێ کرد گوتی من سەد کەسم کوشتووە تۆبەکردن بۆ من هەیە گوتی (بەڵێ) کێ دەبێتە ناوبڕ لەبەینی تۆو لەبەینی

نزیەکردن. تەعریفی دێیەکی نێو- نەصرەت-ی بۆ کوژەرەکە کرد گوتی وەرە ئەوێ کوژەرەکە قەتل) رۆیشت هەتا نیوەی رێگا مردن گەیشتە سەری سینگی سوڕاند بۆ ئەو گوندەی ـوی (نەصرەت) بوو کە بۆ ئەوێ دەچوو بۆ تەوبە. مەلائکەی رەحمەت و میهرەبانی لەگەڵ مەلائکەی (ئازاردان -عەزاب) کەوتنە مشتومڕ هەریەکێک لەم دوولایەنە دەیانگوت عائد بەئێمەیە پاشان خودای گەورە ٠ فەرمانی دا گوتی (نەصرەت). لەم جەنازەیە نزیک بەوە. فەرمانیشی بەو گوندە کرد کە لێی دەرچووبوو لەم جەنازەیە دوور بکەوە. ئنجا خودا فەرمانی بە مەلائکە کرد بەینی هەردوو گوندان بپیون وەکوو دیتییان لەگوندی (نەصرەت) نزیکتر بوو بەبستێک بەهۆی ئەمە کە لەگوندی تۆ بەنزیکتربوو خودا لێی خۆش بوو کەوتە بەر مەرحەمەت و میهرەبانی خودا (خودایە لە لێبوردنی خۆت بێ بەشمان نەکەی).

(ش) بەگوێرەی ووشەی (راهب) ئەم رووداوە دەبی لەپاش هاتنی حەزرەتی عیسێ بووە. لەم حەدیثە وەرگیرا پێویستە ئەوەی تۆبە دەکا دووركەوێتەوە لەجێگاو زەمانی گوناهەکە وە کارێکی وا بکا دووركەوێتەوە لەگوناهی پێشوو.

**٨٩٢: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) إشترى رَجُلٌ مِن رَجُلٍ عقاراً لَهُ فَوَجَدَ الرَّجلُ الذي اشترى العقارَ في عقاره جرَّةً فيها ذَهَبٌ فقالَ له الذي اشترى العقارَ خُذْ ذَهَبَكَ مِنّي اِنّما اشتَرَيْتُ منْك الارضَ وَلَمْ ابتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ وقالَ الّذي له الارضُ انّما بعتُكَ الأرضَ ومافيها فتحاكما الى رَجُلٍ فقالَ الذي تحاكما اِلَيهْ اَلكما وَلَدٌ قالَ احدُهما لي غلامٌ وقالَ الآخَرُ لي جاريةٌ قالَ انكِحوا الغُلامَ الجاريَةَ وانفِقوا على أنفسهما مِنهُ وتصَدَّقا.**

**تەرجەمە**

٨٩٢: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە رەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی پیاوێک لەنەوەی ئیسرائیل خانوێکی لەپیاوێک کڕی کڕیار جەرەیەک زێری لەخانوەکە دۆزییەوە لەنێو خاک و خۆڵ چووە لای فرۆشیار (بائع) گوتی بگرە زێرەکانت من تەنیا خانووم لەتۆ کڕیوە من زێرم لەتۆ نەکڕیوە. فرۆشیاری عەردو خانوو گوتی من عاردم بەتۆ فرۆشتووە بەهەرچی لەنێو هەیە. ئنجا بۆ موحاکەمەو دادوەری چوونەلای حەزرەتی داود (سەلامی خوای لێ بی) بەرەو روو بەهەردوویانی گوت ئێوە منداڵتان هەیە؟ کڕیار گوتی من کوڕێکم هەیە فرۆشیاریش گوتی من کچێکم هەیە فەرمووی کچەکە لەکوڕەکە مارە بکەن لەو زێرەش مەسرەف بکەن لەسەر کوڕو کچەکە وە ئێوەش بەخۆتان نەک (بەواسطەی

کەسێکی تر) بیکەنە صدەقەو خێرو چاکە.

(ش) لەمەزهەبی شافعی ئەگەر کەسێک عاردێکی کڕی ئەو زێڕی لەناوی شاردراوەتەوە نابێتە هی کڕیار. وەکوو کڕینی خانوێک ئەگەر مال و کوتالی تیابی هەر ملکی فرۆشیارە ئەگەر داوا بکا وە ئەگەر داواش نەکا ئی کڕیارە. (دانەر دەلێ) بەلام لەشەرعی حەزرەتی داود هەروەکوو لێرە وا بەدیار دەکەوی ئەبێتە مالی کڕیارو فرۆشیار بۆ صەدەقەو چاکە پێ کردن نەک بۆ خۆیان.

**٨٩٣: عَنْ أسامَةَ بن زَيدٍ (ض) الطّاعونُ رِجسٌ أُرسِلَ على طائِفَةٍ مِنْ بني اسرائيلَ. أو على مَنْ كانَ قبلكُمْ فاذا سمعتُمْ بِهِ بأرضٍ فَلا تقدَموا عَلَيْهِ واذا وَقَعَ بأرضٍ وأنتُمْ بِها فَلا تخرجوا فِراراً مِنْهُ.**

### تەرجەمە

٨٩٣: دەگێڕنەوە لەئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حارثە گوترا ڕەزای خودایان لێ بی تۆ چیت بیستووە لە پێغەمبەر (د) دەرحەق بە طاعون. ئوسامە گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی طاعون عەزابە ناردرا سەر طائفەیەک لەبەنی اسرائیل کە قەومی فیرعەون بوو ودکو زۆر زولمیان کرد یاخۆ فەرمووی ناردرا سەر ئەوانی پێش ئێوە ئنجا وەکوو بیستتان طاعون لەعاردێک هەیە مەچوون بۆ ئەوێ. وە ئەگەر طاعون کەوتە عاردێکیش ئێوەش لەوێ بوون بەمەبەستی ڕاکردن لەوێ مەڕۆن «بەلام بەمەبەستی بازرگانی بڕۆن قەی ناکا».

**٨٩٤: عَن عائِشَةَ (ض) سأَلْتُ رسولَ اللّه صلى الله تعالى عَلَيهِ وَسَلَّم عَنِ الطّاعونِ فأخبَرَني اَنَّهُ عذابٌ يبْعَثُهُ اللّهُ على مَن يَشاء وانَّ اللّهَ جَعَلَهُ رَحمةً للمؤمِنينَ ليسَ مِنْ اَحَدٍ يقعُ الطّاعونُ فيمكُثُ في بَلَدِهِ صابِراً محتسِباً يَعْلَمُ اَنَّهُ لايصيبُهُ اِلاّ ... اللّهُ لَهُ اِلاّ كانَ لَهُ مِثْلُ اَجرِ شهيدٍ.**

### تەرجەمە

٨٩٤: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پرسیم لەپێغەمبەر (د) طاعون چی‌یە فەرمووی طاعون عەزابێکە دەی نێرێتە سەر هەر کەسێکی خۆی حەزبکا لەکافران وە بەبێ شک خودای گەورە گێڕایتی بەمەرحەمەت بۆ ئیمانداران (وە بەشەهید دەژمرێ ئەوی بەم نەخۆشی‌یە بمرێ) هیچ کەسێک نی‌یە کە لەشاری طاعون دابی وە

ئ رامیش بگریّ لەشارەکە بەئارام گرتن لەپێش قەزاو قەدەر. وە دەیزانی موحەقەق تووش ئەبێ ئەو شتە نەبی کە خودا لەسەری نووسیبی ئیلا مەگەر بۆ ئەو کەسە هەیە پاداشت و مەرتەبەی شەهیدێک یا بە طاعونیش نەمرێ یا لەکاتەک وەفات بکا کە نەخۆشی طاعون نەبێ.

(ش) بەڕاستی زاندرا پلەکانی شەهیدان دەربارەی پلەی شەهیدێک و شەهیدێکی تر لەلای خودا. ئنجا ئەم شەهیدەی ئێرە وەکوو کەسێکە لەماڵی خۆی بەنیەتی غەزا دەرچووبێ لەرێگای خودا پاشان بەشتێکی تر وەفات بکا نەک لەشەڕ چاکەی خودا فرەوانە نی یەتی نماندارێش بەهێزترە لە کردەوەی وە بەچاکەترە.

**٨٩٥: عَنْ عَبدِاللّه (ض) قالَ كأنّي أَنْظُرُ الى النبيِّ صلى الله تعالى عليه وسلم يحكي نبيّاً مِنَ الانبياءِ ضَرَبَهُ قَوْمُهُ فأدْمَوْهُ وَهوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ ويقولُ اللّهُمَّ اغْفِرْ لِقَومي فانَّهُمْ لايَعلمونَ.**

### تەرجەمە

٨٩٥: دەگێڕنەوە لەعبدالله کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بی گوتی گۆیا تەماشای پێغەمبەرم دەکرد حیکایەتی ئەحوالی پێغەمبەرێکی دەکرد لەپێغەمبەرانی بەنی اسرائیل بەم تەرزە قەومەکەی لێیان دابوو ئنجا خوێنی لەڕوی خۆی دەسڕی‌یەوە وە دوعاشی بۆ قەومەکەی دەکرد دەی گوت یاخودا گوناهی قەومەکەم داپۆشی چونکی نەزانن جاهلن (لەغەزای ئوحود ئەمە بۆ پێغەمبەریش (د) ڕووی دا لەڕووی پیرۆزی و ددانی پیرۆزی خوێنی دەسڕی‌یەوە دەشی فەرموو ئەی خودایا لەقەومم ببوورە و لێیان خۆش بە.

**٨٩٦: عَنْ ابْنِ عُمر (ض) بَينما رَجُلٌ يجُرُّ اِزارَهُ من الخُيلاءِ خُسِفَ بِهِ فَهْوَ يَتَجلْجَلُ في الأرضِ اِلى يوم القيامَةِ.**

### تەرجەمە

٨٩٦: دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی کاتێک پیاوێک لەبەر دەعیەو خۆبەگەورەزانین دامەنی شمەکی خۆی ڕادەکێشا عارد بەپیاوەکەوە ڕووچوو. ئنجا هەر لەعارد دەچێتە خوارێ هەتا ڕۆژی قیامەت.

(ش) سوهەیلی گوتیتی ئەم بیاوە هێزن بوو پیاوێک بوو لە ئەعرابی فارس غەیری ئەویش گوتوویانە قارون بووە. «اللّهُمَّ ارزقنا التواضُعَ والتخضّعَ بجاه صاحب هذا الحديث الشريف» واتا خودایا پێمان ببەشخی مل کەچی و خۆ بەگەورە نەزانین بۆ خاتری خاوەنی ئەم حەدیثە پیرۆزە.

## بحث مناقب[1] قريش

### باسی نەریتی چاک و ڕەوشتی جوانی قوڕەیش

**٨٩٧: عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ض) تجِدونَ النّاسَ معادِنَ خِيارُهُم في الجاهِلِيةِ خيارهم في الاسلام اذا فقّهوا. وتجِدونَ خيرَ الناسِ في هذا الشّأنِ أشدُّهُم لَهُ كراهِيَةً. وتجدونَ شرَّ النّاسِ ذا الوجْهَيْنِ الذّي يأتي هؤلاءِ بِوَجْهٍ ويأتي هؤلاءِ بِوَجْهٍ.**

### تەرجەمە

٨٩٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی خەلکان دەبینین وەکوو کان و مەعدەنن لەچاکەو خراپە بالاترینی‌یان بەگەورەیی و نەژاد لەزەمانی جاهلیەت و کافری بالاترینی ئەوانن لەدینی اسلامیش بەمەرجێک شارەزایی‌یان پەیداکردبی لەئایین «چونکی گەورەیی لەدین بەنەژاد نی‌یە واتە بەرەچەلەک نی‌یە بەلکی بەشارەزایی و بەزانینە» وە دەشبینین باشترینی خەلکان دەربارەی بوونە خەلیفەو سەرکردایەتی پێ ناخۆشبوونیشیان بۆ ئەو کارانە لەبەر ئەوەی نەوەکوو لەکارو فەرمانی ڕۆژانە بەعەدالەت نەجوولێنەوە. وە دەشبینن بەدترینی خەلکان دوو ڕوێکە بێتە ئەم لایە بەڕوێک بچیتە ئەولایەش بەڕوێک.

**٨٩٨: عَن أَبي هُرَيْرَةَ (ض) النّاسُ تَبَعٌ لِقُرَيْشٍ في هذا الشأنِ مُسلِمهُمْ تَبَعٌ لِمُسْلِمِهِمْ وَكافِرُهُمْ تَبَعٌ لِكافِرِهم وَالنّاسُ معادِنٌ خيارُهُم في الجاهِلِيَّةِ خيارُهُمْ في الاسلام إذا فَقُهوا تجِدونَ من خيرِ الناسِ أشَدَّهُمْ كراهِيَةً لِهذا الشّأْنِ حَتي يَقَعَ فيهِ.**

---

(١) مناقب: ماعرف به من الخصال الحميدة والاخلاق الجميلة/ المنجد ص٨٢٩.
واتا نەریتی چاک و ڕەووشتی جوان.

## تەرجەمە

٨٩٨: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی خەلک گوێ ڕایەڵی قورەیشن دەربارەی خەلافەت و میرایەتی موسولمانی خەڵکی گوێڕایەڵی موسولمانی قورەیشن. کافریشیان گوێ ڕایەڵی کافری قورەیشن (یەعنی چلۆن لەزەمانی کافری و جاهلیەت خەڵکی بەگوێیان دەکردن لەزەمانی ئیسلامیش خەڵکی بەگوێیان دەکەن. خەڵکیش وەکوو کانەکانی ژێرعاردن لەچاکی و خراپی جلۆن لەکان (مەعدەن) هەندێکیان هەن بەنرخ و بەقیمەتن هەندێکیان بێ قیمەتن خەڵکیش وان. باشترینی قورەیش لەجاهلیەت بەهۆی ئەوەی ڕەووشتی باشی هەبووە وەکوو بەخشین و زانین و سینگ فرەوانی (حلم) باشترینی خەڵکن لەئیسلامیش. بەمەرجێک لەزانستی ئاین شارەزابن چونکی شەرەف و گەورەیی لەئیسلام بەباب و باپیر نی‌یە بەلکی بەزۆری زانیاری‌یە -وەکوو ئایەت دەفەرموێ **(إن اکرمکم عند الله اتقاکم)** اتقی - واتە ئەوەی لەخراپە خۆی دەپارێزی و لەخوا دەترسی - ئەوانیش زانایانی ئاین بەدەلیلی ئایەتی پیرۆز **(اِنما یخشی اللّهَ مِن عبادهِ العلماءُ)** وە بەدەلیلی ئەو قسەش **( رأس الحِکمةِ مخافة الله)** واتا لەسەرەوەی هەموو بلیمەتی‌یەک لەخوا ترسانە.

دەبینین کە چاترینی خەڵکی لەهەموکەس زیاتر ڕکی لەخەلیفایەتی و میرایەتی دەبێتەوە. هەتا دەکەونە نێو فەرمان (وەظیفە) لەپاشان ڕک لێ بوونەوە نامینێ. چونکی خودا یارمەتییان دەدا لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانەی پێیان سپێردراوە.

**٨٩٩: عَنْ معاویَةَ (ض) اِنَّ هذا الأمْرَ في قُرَیْشٍ لایُعادیهِمْ اَحَدٌ اِلاّ کَبَّهُ علی وَجْهِهِ مااَقاموا الدِّینَ.**

## تەرجەمە

٨٩٩: دەگێڕنەوە لەمەعاویە (ڕەزای خودایان لێ بی) گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی کاروباری خەلیفایەتی دەگەڕێتەوە بۆ قورەیشی بەحەقی خۆیان. ئەوەی دوژمنایەتیان بکا لەسەر خەلیفایەتی و سەرکردایەتی موسولمان خودا لەسەر ڕووی دەخا بەمەرجێ مافی دین بپارێزن بەلام ئەگەر مافی دین نەپارێزن مافی خەلیفایەتی‌یان نامینێ.

(ش): لەهەندێ نوسخە **(اَکَبَّهُ)** نووسراوە کەچی غەڵەتیشە چونکی ئەم (فعله) لەنوادرە چونکی ثلاثیەکەی متعدی‌یە وەکوو هەمزەی بچیتە سەر نەبێتە لازم لەسەر

پێچەوانەی ئەوەی هەیە (لەسەر عەکس مەعهود) لە أفعال هەروەکوو وایە لە ایەت (أَفَمَنْ يَمشي مُكِبّاً على وَجهِهِ... الخ).

٩٠٠: عَنْ ابْنِ عُمَرَ (ض) لايَزالُ هذ الأمرُ في قُرَيْشٍ مابَقِيَ مِنْهمْ إثنانِ.

### تەرجەمە

٩٠٠: دەگێڕنەوە لەعبداللە کوڕی حەزرەتی عمر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی -کاروباری خەلیفایەتی موسوڵمانان بەاستحقاق واتە بەمافی خۆیان هەردەمینی لەقورەیش هەتا دووپیاو مابی.

(ش) ئەوەوی گوتیتی ئەمە بەڵگەیەکەی دیارە کە خەلیفایەتی بە استحقاق بۆ قورەیشە دروست نییە خەلیفایەتی ئیلا دەبێ بۆ ئەوان بێ. یارانی پێغەمبەر بەڕای هەموویان واتا بەاجماع لەسەر ئەمە بووینە. بەردەوام بوونی ئەم حوکمەش دیارکراوە هەتا دونیا ماوە بە (ما بقي منهم اثنان) یەعنی ئەگەر بێجگە لەقورەیش کەسانی تر فەرمانڕەوایەتی ئیسلامیان کرد ئەمە بە استحقاق نییە بەڵکی بە استحقاق تایبەتە بە قورەیش هەتا ڕۆژی قیامەت.

٩٠١: عَنْ جُبَيْرِ ابنِ مُطعِمٍ (ض) اِنَّما بَنو هاشِمٍ وَبنو المطَّلِبِ شَيءٌ واحِدٌ.

### تەرجەمە

٩٠١: دەگێڕنەوە لەجوبەیری کوڕی مطعم -ڕەزای خودای لێ بی- گوتی من و حەزرەتی عوسمان کوڕی عەفان چووینە خدمەت پێغەمبەر (د) حەزرەتی عوسمان بەپێغەمبەری گوت ئەی پێغەمبەری خودا بەخشیت بە بەنی موطەلبیان ئێمەت تەرک کرد و ئێمەو ئەوانیش بەنسبەت تۆ یەک پایەین یەعنی هەموومان کوڕی عبدالمنافین کە چوار کوڕی هەبووە عبدی شمس و نەوفەل و هاشم و مطلب ئێمە کوڕی عبد شمسین ئێوەش کوڕی هاشمن پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی کورانی هاشم و کوڕانی موطەلب یەک شتن (یەعنی تۆ نسبەتت لەمن دوورترە نە هاشمی و نەمطلبی زەکات لەکوڕانی هاشم حەرامە چونکی باوکی عبدالمطلبی باپیری بووە کە ناوی شەیبە بو لەپاش مردنی هاشم مطلبی برای شەیبەی برازای خۆی لای خاڵان لەمەدینەی هێناوە لای خۆی ناوبراو بە عبدالمطلب ظاهرا لەکوڕانی مطلبیش بۆیێ حەرامە چونکی وەکو هاشم چاوەدێری

پ‌ڕێزگاری باپیری پێغەمبەری کرد هەتا بەغایەتێک نێوی شەیبە بوو پێیان دەگوت عبدالمطلب انجا چونکی تۆ بەنی عبدشمسی صەدەقەو زەکات لەنێود حەرام نی‌یە وەکوو ئێمە».

٩٠٢: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) قُرَيشٌ والانصارُ وَجُهَيْنَةُ وَمُزَيْنَةُ وَاسْلَمُ وأشجُعُ وَغِفارُ مَوالِيّ لَيْسَ لَهُمْ مَولىً دون اللّهِ ورَسولِهِ.

## تەرجەمە

٩٠٢: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی قورەیش (واتا کوڕانی نەضر) و ئەنصار واتا ئەوس و خەزرەج کە دوو کوڕی حارثەی کوڕی تەعلەبەبوون وە تیرەی جوهەینە کە کوڕی لەیثی کوڕی سوەید بوون و تیرەی موزەینە لەچینەکی لە مضر وتیرەی ئەسلەم وە تیرەی ئەشجەع کە تیرەیەکن لە غەطفان وە تیرەی غفار کە تیرەیەکن لەکنانە ئەمانە هەموویان یاریدەدەری منن تایبەتن بەمن بۆ ئەوانە نی‌یە هیچ کار گوزارێک و بەخێوکەرێک خوداو پێغەمبەری خودا نەبێ.

(ش) لەم حەدیثە پیرۆزە گەورەیی‌یەکی دیار هەیە بۆ ئەمانە چونکی ئەمانە پێش خەڵکی تر موسولمان بوون.

٩٠٣: عَنْ اَبي ذَرٍّ (ض) لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ اِدَّعي لِغَيرِ أبيهِ وَهوَ يَعْلَمُهُ اِلاّ كَفَرَ وَمَن اِدَّعي قَوْماً لَيْسَ لَهُ فيهِمْ نَسَبٌ فليتبوّأ مَقْعَدَهُ مِنَ النّارِ.

## تەرجەمە

٩٠٣: دەگێڕنەوە لەئەبو ذدر -جوندەبی کوڕی جەنادەی غفاری (ڕەزای خوای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی نی‌یە هیچ پیاوێک کە خۆی نسبەت بدا بەکوڕایەتی وەباڵ غەیری باوکی خۆی بەخۆیشی بزانی ئەمە باوکی خۆی نی‌یە مەگەر ئەو پیاوە کافر دەبی بەخودا (ئەگەر بە حەلال بزانی) یاخۆ (کفر) لەکفرانە یەعنی ئەم پیاوە انکاری نیعمەتی خودا دەکا وە هەر کەسێکیش خۆی نسبەت بدا بە خزمایەتی کە هیچ خزمی ئەوانیش نەبی با جێگای خۆی سازبدا لەئاگر.

٩٠٤: عَنْ واثِلَةَ ابن الأسقَع (ض) اِنَّ مِنْ أعظَم الغيرا اَنْ يَدّعي الرَّجُلُ الى غيرِ أبيهِ أو يُرِيَ عَيْنَهُ مالَمْ تَرَهُ أو يقولَ على رسول الله صلى الله عليه وسلم مالَمْ يُقُلْ.

## تەرجەمە

٩٠٤: دەگێڕنەوە لەوائلەی کوڕی ئەسقەعی کوڕی کەعبی لیثی (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی لەگەورەترینی بوختان و ئفترایانە کە پیاو نسبەتی خۆی وەباڵ غەیری باوکی خۆی بدا یاخۆ نسبەتێ دیتنی خەونێکی وەباڵ چاوی خۆی بدا کە هیچ خەونیشی نەدیتبی بەدرۆ بلێ خەونم دیوە یاخۆ بەدرۆ قسەیەک نسبەت وەبال پێغەمبەر بدا کە هیچ قسەی پێغەمبەریش نەبێ.

(ش): بۆچی زیادە ڕۆیی هەیە لە گوناهی گەورەی ئەو کەسەی خەونی نەدیتبی بلێ خەونم دیتی‌یە لەو کەسەی لەحالەتی هوشیاری درۆیەک بکا. چونکی درۆ لەخەون بوختانە بەزاتی زۆر پیرۆزی خودا چونکی مەلائکە بەفەرمانی خودا خەونی نیشانی خەلقی دەدەن. وە چونکە خەون بەشێکە لەپێغەمبەرایەتی (نبوەت) پێغەمبەرایەتیش بەخەون نەبێ نابێ ئەو کەسەی درۆزنیشە لەخەون: ئیدعا دەکا خودا نیشانی داوە ئەو شتی کە نەی دیوەو ئیدعاش دەکا بەشێکی لەپێغەمبەرایەتی (نبوەت) دیوە کە هیچیشی نەدیوە ئەمەیان افتراو بوختانە بەخودا کردن کە ئەوەش لەگەورەترینی بوختانانە.

٩٠٥: عَنْ ابْنِ عُمَرَ (ض) غِفارٌ غَفرَ اللّٰهُ لَها واسلَمُ سالَمها اللّٰهُ وعُصيةٌ عَصَتِ اللّٰهَ ورسولَهُ.

## تەرجەمە

٩٠٥: دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی پێغەمبەر (د) لەسەر مینبەر فەرمووی تیرەی (غیفار) خودا عەفووی کردن لەگوناهی ئەو دزیانەی کە لە حاجیانیان دەکرد لەزەمانی پێش ئیسلام تیرەی ئەسلەمیش خودا سەلامەتی کردن بەهۆی نەکردنی کوشتار. تیرەی عوصیەش کە بەشێکن لە بەنی سولەیم لەخوداو پێغەمبەری خودا عاسێ بوون بەهۆی کوشتنی قورئان خوێنەکان لەبیری مەعونە.

(ش): لەم حەدیثە وەرگیراوە کافر گوناهێکی لەزەمانی کافری کردبێ خودا لێی خۆش دەبی وەکوو دەلێن (عفی الله عما سلف) ئەم عبارەتە شیرینەی پڕ جناسە کە بەسەر لێوی پیرۆزی دا هات وەکوو دوڕو گەوهەرە (اتفاقاتی لطیفەیە بێ تەکەلوف بووە).

٩٠٦: عَنْ اَبي بَكرَةَ (ض) اَرَاَيْتَ اِنْ كانَ اسلَمُ وغِفارُ وَمُزَيْنَةُ وَجُهَيْنَةُ خيراً مِن بني تميم وَمِن بني عامِرٍ وَأسَدٍ وغطفانَ خابوا وَخسِروا. قالَ نَعَمْ قالَ والَّذي نفسي بِيَدِهِ اِنَّهُمْ لَخَيْرٌ مِنْهُمْ.

## تەرجەمە

٩٠٦: دەگێڕنەوە لەئەبو بەکرە نوفەیعی کوڕی حارثی کوڕی کەلدە (ڕەزای خوایان لێ بی) بەڕاستی ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمی بەپێغەمبەری گوت بێ شک ئەوانەی تابعی تۆ بووینە لە تیرەی ئەسلەم و غفارو موزەینەو جوهەینە دزو ڕێ گرەکانی حاجیانن. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەرێ پێم بلێ ئەگەر تیرەی ئەسلەم و غیفارو موزەینەو جوهەینە باشتربن لەبەنی تەمیم وە لەبەنی عامر وە لەتیرەی ئەسەدو غەطفان چما بەنی تەمیم ئومێدو خەسارەمەند بوون ئەقرەع گوتی بەڵێ خەسارەمەند بوون ئەگەر ئەوان باشتر بن لەبەنی تەمیم. پێغەمبەر (د) فەرمووی بە اثباتی شەرط بۆ حەولی جەزا بەحەقی ئەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەسلەم و غفارو موزەینەو جوهەینە باشترن لە بەنی تەمیم و ئەسەدو غەطفان و بەنی عامر.

٩٠٧: عَن اَبي هُرَيْرَةَ (ض) أسْلَمُ وغِفارُ وَشيءٌ مِنْ مُزَيْنَةَ وَجُهَينَةَ او قالَ شيءٌ مِن جُهَيْنَةَ أو مُزَينَةَ خيرٌ عِندَ اللّهِ أو قالَ يَوْمَ القيامَةِ مِن أسَدٍ وتميمٍ وَهوازِنَ وغَطَفانَ.

## تەرجەمە

٩٠٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی تیرەی ئەسلەم و غفارو هەندیکیش لەموزەینەو جوهەینە یاخۆ فەرمووی هەندێک لەجوهەینە یا موزەینە شک لە تەرەف ئەوەیە گێڕایتی‌یەوە باشترن لای خودا یاخۆ فەرمووی باشترن ڕۆژی قیامەت لەئەسەدو تەمیم و هەوازن و غەطفان.

(ش) غیفار کوڕی مولەیلی کوڕی ضەمرەی کوڕی بەکری کوڕی عبدی منافی کوڕی کنانەنە ئەبو ذەری غفاری لەوانە. موزەینەش ناوی ژنی عەمری کوڕی ئەدبووە کچی کەلبی کوری وەبرە بووە. عبدالله کوڕی موغەفەلی موزنی لەوان بووە. غەطفانیش کوری سەعدی کوڕی قەیسی کوری عیلانی کوڕی موضەر بووە.

٩٠٨: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لاتقومُ السّاعَةُ حتّى يخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قحطانَ يسوقُ النّاسَ بِعصاهُ.

## تەرجەمە

٩٠٨: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی

قیامەت نایێ هەتا دەردەچی پیاوێک لەقەحطان خەڵک داژوا بەداری خۆی وەکوو شوان و مەڕ لای ئەبو نەعیم کە دەگێڕێتەوە دەرچوونی ئەم پیاوە لەپاش مەهدیەو لەسەر ڕەووشتی ئەویش ڕەفتار دەکا.

**٩٠٩: عَنْ جابرٍ (ض) مابالُ دَعوى اَهْلِ الجاهِلِيَةِ. ثُمَّ قالَ ماشَأنُهُمْ فأخْبِرْ بكَسْعَةِ المهاجريِّ الأنصاريَّ فقالَ دَعوها فانَّها خَبيثَةٌ. وَقالَ عبداللّهِ بن أبيِّ بن سَلول. اَقَدْ تَداعَوا عَلَيْنا لَئِن رَجَعْنا اِلى المدينةِ لِيخْرِجَنَّ الأعزُّ مِنّا الأذَلَّ فقالَ عُمَرْ اَلا نقتُلُ يانبيَّ اللّهِ هذا الخبيثَ لِعَبْدِ اللّهِ فقالَ لا يَتحدَّثُ النّاسُ اَنَّهُ كانَ يَقتُلُ اَصحابَهُ.**

## تەرجەمە

٩٠٩: دەگێڕنەوە لەجابر (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی لەساڵی شەشەمی کۆچی لەغەزای مورەیسع لەگەڵ عالەمێکی زۆر لەموهاجران لەخدمەت پێغەمبەر بووین. لەموهاجیرەکان پیاوێکی گاڵتەکەر هەبوو نێوی جەهجاهی کوڕی قەیسی غیفاری بوو بەدەست یا باقاچ شەقێکی لەلای پشتەوەی پیاوێکی ئەنصاری دا نێوی سەنانی کوڕی وەبرە بوو. سنان زۆر ڕقی بۆوە قسەیان بەیەکتری گوت هەتا وای لێ هات سنان هاواری کردە ئەنصاریان چونکی بەخۆی خەزرەجی بوو جەهجاهیش هاواری کردە موهاجیران. پێغەمبەر (د) تەشریفی هاتە دەرێ فەرمووی چی‌یە ئەو دەعوایەی ئەهلی جاهلیەت. پاشان پرسیاری کرد ئەمە چی‌یە بۆچی وادەکەن پێ‌یان گوت کە موهاجیری شەقێکی لەلای پشتەوەی ئەنصاری‌یەکدا. فەرمووی وازبێن لەنەفسانیەت و دەعوای جاهلیەت. چونکی زۆر پیسە. سەردەکێشی بۆ سەر ڕک لێ بوونەوەو دوژمنایەتی عبداللەی کوری ئوبەی کوری سەلول سەرۆکی دووڕووەکان (منافقان) بوو گوتی وای ئەرێ ئەوا خۆ بۆ سەر ئێمە (مەبەستی ئەنصاری بوو) هاوار دەکەن موهاجیران. سوێندبێ دەبێ وەکوو چوینەوە مەدینە. ئەوەی کە بەهێزترە بێ‌هێزەکان دەرکەن- مەبەستی لەبێ هێزەکان -موهاجیرەکان بوو- حەزرەتی عومەر گوتی ئەرێ نەی کوژین ئەی پێغەمبەری خودا ئەم پیسو منافقە (مەبەستی عبداللەی کوری ئوبەی بوو) پێغەمبەر (د) فەرمووی (نا) مەی کوژن خەڵکی دەڵێن محمد یارانی خۆی دەکوژی.

**٩١٠: عَنْ اَبي ذَرِّ الغِفاري (ض) يا اَبا ذَرّ اُكْتُمْ هذا الأمْرَ وارجِعْ اِلى بلدِكَ. فاذا بَلَغَكَ ظهُورُنا فاقْبِلْ.**

## تەرجەمە

٩١٠: دەگێڕنەوە لەئەبو ذەر (ڕەزای خودای لێ بی) من پیاوێک بووم لە تیرەی (غیفار) خەبەرمان زانی پیاوێک دەرچووە لەمەککە وا داوا دەکا کە پێغەمبەرە. خەبەری ئەنسمان بۆدێ منیش بەئەنیسی برای خۆم گوت بچۆ لای ئەم پیاوە قسەی لەگەڵ بکە وە خەبەری ئەویشم بۆ بێنەوە. ئەنیسی برام ڕۆیشت هەتا چووە ناو مەککە بەخدمەت پێغەمبەر گەیشت لەپاشان گەراوە پێم گوت چی هەوالت لا هەیە گوتی والله ئەم پیاوەم وادیت فەرمان بە چاکە دەکاو داوا لەخەڵک دەکا خەراپە نەکەن وە ڕەووشتی زۆر باشی هەیە قسەیەکیشی هەیە شیعر نی‌یە. منیش گوتم خەبەرێکی وات بۆ نەهێنامەوە دڵم پێ ئارام بگری. هەمبانەیەکم لەنان و ئاو هەڵگرت و بەدارێکەوە ڕووم کردە لای مەککە. بەڕاستی ئەگەرچی چوومە ناو مەککە. بەڵام ئەم پیاوەی کە دەم ویست نەمدەناسی پێشم ناخۆش بوو پرسیار لەقوڕەیش بکەم کە نیشانم بدەن نەوەک ئازارم بدەن. هەر ئاوی زەمزەمم دەخواردەوە جێگام کەعبە بوو. پاشان عەلی کوڕی ئەبو طالب بەلام ڕەت بوو گوتی وا پێ دەچی تۆ پیاوێکی بێگانەو غەریب بی. گوتم بەڵێ گوتی وەرە لەگەڵ من بۆ ماڵی ئێمە گوتی لەگەڵی چووم بەڵام نە ئەو قسەیەکی کرد نەمنیش قسەی خۆم بۆ ئەو کرد. سبەینە داهات هاتمەوە (کەعبە) پرسیاریش ناکەم لەئەحوالی پێغەمبەر (د) هیچ کەسیش نەبوو خەبەرێکم لەئەحوالی ئەو پێ بدا. پاشان دووبارە دیتم عەلی بەلام دا ڕەت بوو ڕووی لەمن کرد گوتی هێشتا قۆناغێکت بۆخۆت نەدۆزیتەوە کە جێگایەکی تایبەتیت هەبێ گوتم (نەخێر) گوتی وەرە لەگەڵ من پێی گوتم ئیشت چی‌یە؟ وە بۆچی هاتی‌یە ئەم شارە؟ منیش گوتم ئەگەر سرم لێ ئاشکرا نەکەی خەبەرت پێ دەدەم. عەلی گوتی بەگوێرەی خواستی تۆ دەجوولێمەوە گوتی پێم گوت پێمان گەیشتووە پیاوێک لێرە پەیدا بووە داوادەکا کە پێغەمبەرە. برای خۆم لەپێش ناردە لای قسەی لەگەڵ بکا پاشان گەڕاوە خەبەرێکی وای بۆ نەهێنامەوە دڵم ئارامی پێ بگری ئنجا حەزدەکەم خۆم قسەی لەگەڵدا بکەم. عەلی پێی گوتم. مەبەستت پێکاوە ئەوا من بۆلای ئەو دەچم تۆ لەدوای من بڕۆ. بۆ هەرجێگایەک چووم تۆش وەرە ئەگەر هات و لەڕێگا تووشی یەکێکی وا هاتین کە دەرحەق بەتۆ لێی بترسیم من لەتەنیشت دیوارێک ڕادەوەستم بە بەهانەی چاک کردنی نەعلەکەم تۆ هەر بڕۆ ڕامەوەستە. ئنجا عەلی ڕۆیی منیش لەگەڵی ڕۆیشتم هەتا چووینە خدمەت پێغەمبەر. پێم گوت ئاینی ئیسلامم فێر بکە ئەویش ئایینی فێرکردم. لەجێگای خۆم موسولمان بووم ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی (ئەی ئەبو ذەر ئەم ئیسلام بوونەی خۆت بشێرەوە بگەڕێیەوە شوێنی خۆت نیشتمانی خۆت وەکوو دەنگوباسی سەرکەوتنی ئێمەت

پێ گەیشت وەرەوە) منیش گوتم: بەحەقی ئەو زاتەی تۆی ناردووە بەحەق و بە پێغەمبەر. لەنێو کۆمەڵی قورەیش بەدەنگێکی بەرز هاواردەکەم بە ووشەی خوا بەیەک زانین (واتا کلمەی تەوحید) ئنجا چوومە کەعبە قورەیش جەماعەتیان لەوێ بوو گوتم ئەی جەماعەتی قورەیش (إنّي أشهَدُ ان لا اله الا اللّه وأشهد ان محمدً رَسولُ اللّه).

گۆتیان لێی هەلستن ئەمە -صائبە- واتا لەدینێک چوویتە سەر دینێکی تر. هەلستان لەهەر لا منیان داگرت بەلێدانێکی وا کە بمرم لەپاشان - عەباسم پێ گەیشت خۆی بەسەردادام رووی لەوان کرد. گوتی ئەی هاوار بۆ حالی ئێوە. ئێوە تەماتانە پیاوێک بکوژن لە (غیفار) کە جێگای تجارەت و بازرگانی ئێوەن وە جێگای تێ پەڕبوونی ئێوەن ئنجا بەرەڵلایان کردم. دووبارە وەکوو کەوتمەوە سبەینە وەکوو دوێنێ بەئاشکرا ووشەی (شەهادەم) هێنا لەنێو جەماعەتی قورەیش بەدەنگێکی بەرز. دووبارە قورەیش لێم بلندبوون. دەردی دوێنێ یان دامێ دیسان عەباسم پێ گەیشت خۆی بەسەردا داهێنام ڕزگارم بوو ئەمەبوو سەرەتای ئیسلام بوونی ئەبوو ذەر.

٩١١: عَن عائِشَةَ (ض) كيفَ بنسبي فقالَ حَسّانُ لاسَلَّنَّكَ مِنهُمْ كما تُسَلُّ الشعَرَةُ مِن العجِينِ.

### تەرجەمە

٩١١: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە -ڕەزای خودای لێ بی حەسان کوڕی ثابت ئیزنی لە پێغەمبەر وەرگرت بۆ ئەوەی جوێن بە کافرەکانی مەککە بدا لەقورەیش. پێغەمبەر (فەرمووی چلۆن هەجویان دەکەی نەسەبەی منیش قورەیشە حەسان گوتی لەهەجو نەسەبی تۆ لە قورەیش بە سافی و خالص دەردەکێشم وەکوو دەرکێشانی موو لەناو هەویر.

٩١٢: عَنْ جُبيْر بْن مُطعِمْ (ض) لي خمسةُ أسماءِ أنا مُحمَّدٌ وأحَمَدُ وَ انا الماحي الذّي يَمْحو اللّهُ بي الكُفْرَ وَانا الحاشِرُ الذّي يَحْشُرُ النّاسُ عَلى قَدَمي وَانا العاقِبْ.

### تەرجەمە

٩١٢: دەگێڕنەوە لە جوبەیری کوڕی موطعم -ڕەزای خودای لێ بی- فەرمووی بۆ من هەیە پێنج نێوی تایبەتی لەگەڵ ناوبراو واتە خۆی بەتەواوی ڕێک دەکەوی -لەگەڵ خەڵکی تر ڕێک ناکەوێ من محەمدم واتا زۆر بە دووبارەکردنەوە سوپاس دەکرێم وە

(احمد)م (به اسم التفضيل بیٚ ئەوەی مفضل عليه باس بكریٚ) یەعنی انا احمد جميع الحامدين ومن ماحييكم - واتا سوپاس کراوی هەموو ئەوانم کە سوپاسم دەکەن. خودا كوفر بەمن ناهێلی واتا هێزو دەسەڵاتی کافری بەهۆی منەوە ناهێلی مەحوی دەکاتەوە. وە من كۆكەرەوەیەکم خودا لەپاش حەشری من خەڵکی لەدەشتی مەحشەر کۆدەکاتەوە وە من (عاقبيشم) واتا من لەدوای هەموو پێغەمبەران هاتووم هیچ پێغەمبەر لەپاش من نایێ.

(بۆ هاتنی خۆم -قەریحە): ئنجا بەڕاستی هیچ ناوبراوێکی وا ڕێک بکەوێ لەگەڵ واتای ناوەکە. وەک ناوەکانی پێغەمبەر لەهیچ کەسێکی تر نەهاتوەتە جێ. لەبەر ئەوەی کە ئەم تایبەت مەندیەیە هەر بۆ پێغەمبەر بێ. لەسەرەتای حەدیث جارو مەجرور پێش خراوە.

٩١٣: عَنْ اَبي هُرَيْرَة (ض) اَلا تعجَبون كيْفَ يَصرْفُ اللّٰهُ عَنّي شَتْمَ قُرَيْشٍ وَلَعْنَهُمْ: يشتمونَ مُذَمَّماً وَيلعنونَ مُذَمَّماً. وانا محمدٌ.

### تەرجەمە

٩١٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی نەرێ ئێوە سەرتان لەوە سوڕنامێنێ خودا چلۆن جوێن و لەعنەتی قورەیش لەمن لادەدا چونکی ئەوان جوێن بە (مذمم) دەدەن واتا جوێن پێ دراو من ناوم (مذمم) نیيە من ناوم (محمد)ە. من (محمد)م. (ش): هۆی هاتنی ئەم حەدیثە بەسەر زمانی پێغەمبەر (د) ئەوەبوو کافرەکانی قورەیش لەڕقان ناوی محمدیان بەئاشکرا نەدەهێنا چونکی ناوی محمد واتای سوپاس و ستایش لێ کراوە ئنجا ئەگەر ناویان بهێنایە بەپلار لەجیاتی محمد دەیانگوت (مذمم) ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی جوێنی قورەیش بۆمن ناگەڕێتەوە جوێنەکە بەمن نیيە بە ئیلهامی خودا ناوم محمدە بەلکی دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک ئەمی لێ بوەشێتەوە وە ڕەووشتی خراپی هەبێ.

٩١٤: عَنْ جابر (ض) مَثَلي وَمَثَلُ الأنبياءِ كَرَجُلٍ بَنى داراً فأكْمَلَها وَاَحسنها اِلاَّ مَوضِعَ لَبِنَةٍ فَجَعلَ النّاسُ. يَدْخُلونَها وَيتعَجَّبونَ وَيَقولونَ لولا مَوضِعَ اللَّبِنَةِ وَانا مَوضِعَ اللَّبِنَةِ جِئتُ فَخُتِمَتِ الأنبياءُ.

## تەرجەمە

٩١٤: دەگێڕنەوە لەجابری کوری عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی وێنەی من و وێنەی پێغەمبەرانی پێشوو وەکوو پیاوێکە خانووێکی دروست کردبێ ئنجا تەواویشی کردبێ زۆر باشیش ڕازاندبیتی‌یەوە مەگەر جێگای خشتێک نەبێ چۆل بی و کەلەن بی پاشان خەلکی بێن بۆناو خانوەکەو سەریان سورِبمینێ لەچاکی و جوانی خانوەکەو بلێن کاشکی ئەم کەلەنە نەبوایە ئەگەر لەبەر ئەم کەلەنە نەبوایە کە جێگای یەک خشتە خانوێکی بێ قصوربوو. منیش هاتمە جێگای ئەو خشتە هاتنی پێغەمبەران بەمن تەواو بوو. ئنجا منم خشتەکەو منم خاتەمی ئەنبیا.

٩١٥: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) بُعِثْتُ مِنْ خَيْرِ قرونِ بني آدمَ قَرْناً فَقَرْناً حتّى كنتُ مِنَ القَرْنِ الَّذي كنتُ فيه.

## تەرجەمە

٩١٥: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی من ناردراوم بۆ پێغەمبەرایەتی لەباشترینی (سەدەکان)ی کورانی ئادەم سەدە لەپاش سەدە هەتا داخلی ئەم سەدەیە بووم کە تیامە یەعنی سەدەکانی من باشترین سەدەن لەهەر کاتێک.

(ش): چونکی لەسەرەتاوە لەپشتی اسماعیل و سەدەی ئەو گۆزرامەوە بۆ سەدەی (کنانە) پاشان بۆ سەدەی (قورەیش) پاشان بۆ سەدەی بەنی هاشم واتا باب و باپیرانم هەموو لەهەلبژاردراوان بوونە.

٩١٦: عَنْ عبدالله ابنِ عُمَرَ رضِيِ اللّهُ عَنْهُما اِنَّ مِن خيارِكُم احسَنَكُمْ اَخلاقاً.

## تەرجەمە

٩١٦: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوری عومەر (ڕەزای خودایان لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی لەباشترینی ئێوەیە باشترینتان بەڕەووشت یەعنی ئەو کەسەیە لەکارەکانی کاری چاک هەلبژێری. لەخراپە خۆی لابدا ئنجا ئەوەش غەریزەبێ یان لەفێرکردنەوە هاتبێ.

استدلالی کردووه قائلی اول بەحەدیثی ابن مەسعود - واتا بێژەری یەکەم بەو حەدیثی
ـە کوڕی مەسعود گێڕدراوەتەوە کردیتی‌یە بەڵگە لەلای بوخاری کە دەڵێ (**ان الله تعالى قسَمَ بينكُم اخلاقكم كما قَسَمَ بينكم أرزاقكُمْ**). دیارە ئەو دابەش کردنی کەلای خوداوە
:ندراوە بەهیچ شتێک ناگۆڕی چەجایی بە فێرکردن.

**٩١٧: عَنْ عائِشَةَ (ض) تنامُ عَيني وَلايَنامُ قَلْبي.**

### تەرجەمە

٩١٧: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە (ڕەزای خودای لێ بی). پێغەمبەر (د) فەرمووی
من چاوم ئەخەوێ بەڵام بەهیچ جۆرێک دڵم ناخەوی.

## باب علامات النّبوَّةِ
## (باسی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی)

**٩١٨: عَنْ عَبداللّه ابْنِ مَسعودٍ (ض) أُطلِبوا فَضْلَةً مِنْ ماءٍ فجاءوا بأناءٍ فيهِ ماءٌ قليلٌ فأدْخَلَ يَدَهُ في الأناءِ ثُمَّ قالَ حيٌّ على الطّهور المباركِ والبَرَكةُ مِنَ اللّهِ.**

### تەرجەمە

٩١٨: دەگێڕنەوە لەعەبداللەی کوڕی مەسعود (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی لەسەفەرێک لەخدمەت پێغەمبەر بووین (د) ئاویشمان کەم بوو فەرمووی لەجێگایەک نەختێ ئاو مابێتەوە بۆم بێنن قاپێکیان بۆ هێنا نەختێ ئاوی تیابوو دەستی پیرۆزی لەناو قاپەکە دانا پاشان فەرمووی وەرنە سەر ئاوێکی کە پیرۆزە (موبارەکە) چونکی زیادبوونی لەلایەن خودایە. وە بەرەکەت و زیادکردنیش لەخوداوەیە. کوڕی مەسعود گوتی دیتم بەچاوی خۆم ئاو لەگۆشتی ناوەندی ئەنگوستەکانی دەردەچوو وە گۆتیشی ئێمە جەماعەتی ئەصحاب -یارانی پێغەمبەر- لەخدمەت پێغەمبەر بووین (د) خواردنمان دەخوارد گوێمان لەدەنگی تەسبیحاتی خواردنەکە دەبوو.

**٩١٩: عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ض) لاتقومُ السّاعَةُ حتّى تقاتِلوا قوماً نِعالُهَمُ الشعرُ وَحتّى تقاتِلوا التّركَ صِغارَ العيونِ.**

### تەرجەمە

٩١٩: ئەم حەدیثە لەمە پێش ڕەت بووە بەڵام لەدوایی ئەم گێرانەوەیە فەرمووێتیشی (وَلَيأتينَّ على اَحدِكُمْ زَمانٌ لأَن يراني اَحبُّ اليه من اَن يكونَ لَهُ مثلُ اَهْلِهِ وَماله) یەعنی لەپاش من دێتە سەر یەکێکتان بەبێ شکو گومان زەمانێک دیتنی منتان لاخۆشەویست تر دەبی لەسێ ئەوەندەی ماڵ و منداڵی خۆتان. یەعنی دیتنی من زیاتر پەسند دەکەن لەسەر منداڵتان. (ش) ئەمە یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (د) چونکی لەزەمانی یارانی پێغەمبەر (صەحابە) تا ئەم تەئریخە (مێژووە) کەساڵی ١٣٧١ هەزارە سێ سەدو هەفتاویەکی هیجری‌یە هیچ یەکێک لەئیمانداران تەصەور ناکرێ کە دیتنی پێغەمبەر (د) بەپێش نەخا لەسەر هەبوونی ماڵ و منداڵ.

٩٢٠: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لاتقومُ السّاعَةُ حتّى تقاتلوا خوزاً وَكِرْماناً مِن الأعاجم حُمرَ الوجوهِ فُطسَ الانوفِ صفارَ الأعيُنِ كانَّ وجوهَهُمْ الجانُّ الُمطرقَةُ نِعالهُمُ الشّعْرُ.

### تەرجەمە

٩٢٠: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی قیامەت ذانایێ هەتا کوشتار دەکەن لەگەڵ خەڵکی خوزو کرمان (خوز: لەووڵاتی ئەهوازە داخلی عیراقی عەجەمە) کرمانیش هەر لە عەجەمە. بۆیێ فەرمووی لەعەجەمانن ڕوویان سوورە لووتیان پانە چاویان بچووکن ڕوویان گۆیا مەتاڵێکە پێستەی بەسەر داگیراوە (یەعنی ڕوومەتیان خڕو پڕە) کەوشیان مووە.

(ش): ئەم کوشتارە لەخەلافەتی حەزرەتی عومەر کرا وەکوو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هاتە سەر عیراق و عەجەم گرتی ئەم ڕاگەیاندنەش لەلایەن پێغەمبەر (د) موعجیزەیە.

٩٢١: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ يُهلِكُ النّاسَ هذا الحَيُّ مِنْ قُرَيْشٍ قالوا فما تأمُرُنا. قالَ لَوْ اَنَّ النّاسَ اعتزلوهُمْ.

### تەرجەمە

٩٢١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی.

هەندێ لەم تیرەی قورەیش خەلک بەهیلاک دەدەن چونکی داوای پاشایەتی دەکەن. یارانی پێغەمبەر گوتیان ئنجا چە فەرمانمان پێ دەکەی وەکوو کەوتینە ئەو زەمانە فەرمووی ئەگەر خەڵکی لێیان دوورکەونەوە بەم تەرزە تێکەلیان نەبن کوشتاریان لەگەڵ نەکەن باشترە بۆ ئەوان.

٩٢٢: عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ض) هَلاكُ أُمَّتي على يَدَيْ غِلْمَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ.

**تەرجەمە**

٩٢٢: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی -هیلاکی ئومەتی من- واتا لەناوچوونی نەتەوەی من لەسەردەستی چەند هەتیووتالیک دەبی لەقورەیش.

٩٢٣: عَنْ حُذَيْفَةَ (ض) فَقُلْتُ يارسولَ الله فَهَلْ بَعْدَ هذا الخيْرِ مِنْ شرّ قالَ نَعَمْ قُلْتُ وَهلْ بَعْدَ الشَرِّ مِن خيرْ قالَ نَعَمْ وفيهِ دَخَنٌ. قُلْتُ وَما دَخَنُهُ قالَ قَوْمٌ يَهدونَ بِغيْرِ هديي تعْرِفُ مِنهْم وَتُنكِرُ قُلْتُ فَهَلْ بَعْدَ ذلِكَ الخيْرِ مِنْ شَرّ قالَ نَعَمْ دُعاةٌ الى ابواب جَهَنَّمَ مَن أَجابَهُمْ اِلَيْها قَذفوهُ فيها قُلْتُ يارسولَ اللّه صِفهُمْ لنا فقالَ هم مِنْ جِلْدَتِنا ويتكلّمونَ بالسنتنا قُلْتُ فما تامرُني إن أدْرَكني ذلِكَ قالَ تَلْزَمُ جَماعةُ المسلمينَ وَإمامَهُمْ فانْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ جماعَةٌ وَلا إمامٌ قالَ فاعتزِلْ تِلْكَ الفِرَقَ كُلها وَلَوْ اَنْ تَعَضُّ بأصْلِ شَجَرَةٍ حتّى يدركَكَ الموتُ وانتَ على ذلِك.

**تەرجەمە**

٩٢٣: دەگێرنەوە لە حوذەیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خودای لێ بی گوتی جەماعەتی یارانی پێغەمبەر (ئەصحاب) لەزەمانی پێغەمبەر پرسیاری شتی چاکەیان لێ دەکرد. منیش پرسیاری شتی شەڕم دەکرد نەوەک تووش ببم. ئنجا پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە لەکافری و ڕێ بزرکردن دا بووین ئەوا خودا بەناردنی تۆ خودا ئێمەی پیرۆزکرد بەدینی پاکی ئیسلام و بەم چاکە گەورەیە ئنجا لەپاش ئەم خێرە گەورەیە تووشی هیچ شەڕێک دەبین؟. فەرمووی بەڵێ پێم گوت لەپاش شەڕەکە تووشی هیچ خێرێکی تر دەبین فەرمووی (بەڵێ) لەناویشی هەیە لێلی یەک ناخۆشییەک پێم کوت ناخۆشیەکە چییە فەرمووی قەومێکی ڕێگای ڕاست بەخەڵکی دەلێن خۆشیان لەسەر ڕێگانین و لەدوو سونەتی من

نارۆن چاکە لەوان دەبینی انکاری چاکەکەش دەکەن چونکی خۆیان کاری پێ ناکەن. یاخۆ مەعنا چەند کارەکی موافقی شەرع لەوان دەبینی‌وە چەند کاری پێچەوانەی شەرعیش لەوان دەبینی. پێم گوت لەپاش ئەم خێرەی فەرمووت هیچ شەڕی تر هەیە فەرمووی بەڵێ چەند دەعوەت کەرێکن بۆ دەرگەکانی جەهەنەم دەعوەتی خەڵکی دەکەن بۆ ڕێ بزرکردن وە خەڵکی قەدەغە دەکەن لەگرتنی ڕێگای ڕاست هەرکەسێک تابعی دەعوەتیان بی فڕەی دەدەنە ناو جەهەنەم پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا وەصفی ئەم دەعوەت کەرانەمان بۆ بکە فەرمووی هەر لەخۆمانن (واتا لەعەرەبانن یا لەمیلەتی ئیسلامن وە قسە بەزمانی ئێمە دەکەن (واتا بەعەرەبی قەسە دەکەن یاخۆ مەعنا وەکوو ئێمە بەزمان دەڵێن خودا وای گوت پێغەمبەر وای گوت کرداریشیان غەیری گوفتاری‌یان) پێم گوت ئەگەر تووشی ئەم قەومە هاتین ئێمە چی بکەین فەرمووی تابعی جەماعەت و زۆربەی موسولمانان بە تابعی ئەمیریان بە. با زولمیشت لێ بکا پێم گوت ئەدی ئەگەر جەماعەتی موسولمان و ئیمام اجتماعیان نەبوو لەسەر طاعەت فەرمووی لەهەموو فیرقەکان جودابەوە ئەگەر بەددانان خۆت بەبنی دارێکەوە گرتبی هەتا مردنت پێ دەگا. یەعنی بەتەنهایی هەموو ناخۆشیەک هەڵبگرد هەتا دەمری ئەمە باشترە نەوەک بچی‌یە ناو قەڵەباڵغی و ئیزدحام.

(ش) دانەری ئەم پەرتووکەش دەڵێ (منیش دەڵێم ئەوا لەتەئریخی نووسینی ئەم دێرانە لە عەینی بی اجتماعی ئیمام و موسولمانانین کە مێژووی ١٣٧١ هیجری ١٩٥١ هەزارو نۆسەدو پەنجاو یەکی میلادی‌یە.

**٩٢٤: عَن عليٍّ (ض) يأتي في آخِرِ الزَّمانِ قومٌ حُدَثاءُ الأسنانِ سفهاءُ الاحلام يقولون من قَولِ خير البريَّةِ يَمرقونَ من الاسلام كما يَمرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمْيةِ لايجاوزُ إيمانُهُمْ حَناجرَهُمْ فاينما لقيتموهُمْ فانَّ قتلَهُمْ اجْرٌ لِمَنْ قتَلَهُمْ يَوْمَ القيامَةِ.**

**تەرجەمە**

٩٢٤: دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عەلی ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو حەدیثێکی پێغەمبەرتان بۆ بخوێنمەوە وەپێم خۆشترە لەئاسمان بکەومە خوارەوە بەهیلاک بچم نەوەک درۆیەک لە حەدیثەکە بکەم بەڵام ئەگەر لەبەینی خۆمان قسەیەکتان لەگەڵ بکەم لەوانەیە بەتەوریەو تەئویل (واتە بەلێکدانەوەی خۆمان) قسەیەکی پێچەوانەی ئەوەی ڕووی داوە بیکەم بۆ مەصلحەتێکی شەرعی وەکوو درۆکردن لەکوشتاری دوژمن چونکی حەدیثە دەڵێ - الحرب خدعة- واتا شەڕ فێڵە با بەدرۆیشبی بیستم لەپێغەمبەر (د) دەیفەرموو

ئاخری زەمان قەومێک دێن لەتەمەن بچووکن لەعەقل زەعیفن لەمەسئەلەی تەحکیم دەڵێن (لاحکم الاّ للّهِ) کەقسەی چاترینی خەڵکە. ئەگەرچی قسەکەیشیان ڕاستەو حەقە بەڵام مەبەستیان خراپەیە. ئەمانە بەتیژی دەردەچن لەئاینی ئیسلام وەکوو دەرچوونی تیر لەجەستەی نێچیر لەلایەن تیرەندازی بەهێز ئیمانیان و باوەڕییان لەگەروویان تێ ناپەڕێ (واتا ئیمان ناچیتە ناو دڵیان چونکی جێگای باوەڕ دڵە) ئنجا لەهەر جێگایەک تووشیان هاتن بیانکوژن چونکی بەڕاستی کوشتنیان پاداشتە ڕۆژی قیامەت. چونکی ئەمانە بۆ خراپە هەوڵدەدەن ناتەبایی و جیاوازی دەخەنە نێو عالەمی ئیسلام بۆ ئەوەی حکومەتی ئیسلام خەریک بکەن ئاگای لەجیهادی کافران نەمێنێ.

(ش) ئەم حەدیثە پیرۆزە بەڵگەیە بۆ ئەوکەسەی خەوارج بەکافر دادەنێن لەسەر قسەی (سبکی).

حەزرەتی علی لەبەر ئەم حەدیثە پیرۆزە کوشتاری خەوارجی کرد.

**٩٢٥: عَن خبّاب ابنِ الأرَتّ (ض) كانَ الرَّجُلُ فيمَن قبلكُم يُحفَرُ لَهُ في الأرضِ فيجْعَلُ فيهِ فيُجاءُ بالمِيشارِ فيوضَعُ على رأسِهِ فيُشقُّ باثنتينِ وَما يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دينهِ ويُمْشَطُ بأمشاطِ الحديدِ ماَدونَ لحمِهِ مِن عَظمٍ وَعَصَبٍ وَما يَصُدُّهُ ذلِك عَنْ دينِهِ. واللّهِ لَيُتِمَّنَّ هذا الأمرَ حتّى يسيرَ الرّاكِبُ مِن صنعاءَ الى حضرَمَوْتَ لايَخافُ اِلاّ اللّهَ عَزَوجَلَّ أو الذئبَ على غَنَمِهِ ولكنكُمْ تستعجِلونَ.**

## تەرجەمە

٩٢٥: دەگێڕنەوە لەخەبابی کوری ئەرەتی (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) لەسێبەری کەعبە پاڵی بەدووگردی خۆیدابوو چووینە خدمەتی بەشکایەت لەدەست جەورو جەفای کافرەکانی قورەیش پێمان گوت ئەرێ ڕجایەک ناکەی لەخودا سەرمان بخا لەسەر ئەم کافرانە بەلکی ڕزگارمان دەبی لەم عەزابەیان فەرمووی لەعالەمی پێش ئێوە پیاوی واهەبوو قۆرتی بۆ هەڵدەکەندرا لەعارد ئنجا دەخرا نێو قورتەکە پاشان مشار دەهێنرا دەخرایە سەر سەرکی (چونکی سەری بەدەرەوەبوو) سەرکیان دەکردە دووکەرت ئەم عەزابە گەورەیەی ئەوی قەدەغە نەکرد لەئاینی خۆی وە شەیی ئاسنیان دەهینا بەبن گۆشتی جەستەیان دەخست گۆشتەکەیان لەڕەگ و ئێسقان جودا دەکردەوە. ئەو ئازارە زۆرە ئەوی قەدەغە نەدەکرد لەئایینی خۆی. قەسەم بەخودا (واتا سوێندم بەخودا)ی گەورە خودا ئەو کارەی ئیسلام تەواو دەکا هەتا بەئەنجامێک سوار لەسەنعاوە دەڕوا بۆ حەزرەمۆت

بەتەواوی ئاسایش لەکافرو دوژمنان لەخودا نەبی لەهیچ کەسێک ناترسی یاخۆ لەگورگیش نەبی لەسەر مەری بەڵام ئێوە پەلە دەکەن (واتا پەلەمەکەن چونکی بۆ تەوابوونی ئەو کارە کاتێکی دیارکراوو داندراو هەیە.

(ش) ئەمە یەکێکە لەموعجیزەکانی پێغەمبەر (د) کە لەپاش کۆچ کردن بۆ مەدینە چۆنی فەرموو وابوو.

٩٢٦: عَنْ اَنَسٍ (ض). اِذهَبْ اليـهِ فَـقُلْ لَهُ اِنَّكَ لَسْتَ مِن اهلِ النّارِ وَلَكِن مِن اَهلِ الجنَّةِ.

## تەرجەمە

٩٢٦: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەهەواڵی ثابت کوڕی قەیسی خوطەبە خوێنی پێغەمبەرو ئەنصاران پرسی فەرمووی بۆچی دیار نی‌یە؟. سەعیدی کوڕی عوبادە گوتی من دەچم هەواڵی ئەووت بۆ دێنم ئەی پێغەمبەری خودا. سەعید وەکوو چووە لای دیتی لەخانوەکەی خۆی بەکزو مەلولی دانیشتووە. سەری دانەواندووە. بەغەمناکی گوتی ئەی ثابت چیت بەسەر هاتووە وا پەرێشانت دەبینم گوتی خراپم بەسەرهاتووە (ئنجا بەشێوەیەکی وا قسەی کرد هەروەکو ئەو لەوێ نەبێ). گوتی ئەم پیاوە -ثابتە- حالی وابوو دەنگی خۆی بەسەر دەنگی پێغەمبەر دەخست ئەم ئایەتە پیرۆزەش (لاترفَعوا اصواتكُمْ فوق صوتِ النبّي). هاتە خوارێ لام وابێ دەرحەق بەو بووە وەهیچ چاکەشی نەماوە وەبوویتە ئەهلی ئاگر سەعید بەهەواڵی (ثابت)ەوە گەڕاوە لای پێغەمبەر (د) قسەکانی ثابتی بۆ گێڕاوە فەرمووی ئەم جارەش بچۆوە لای پێی بلێ بەموژدە تۆ ئەهلی ئاگرنی ئەهلی بەهەشتی.

(ش): بەڕاستی فەرموودەی پێغەمبەر کە موژدەی بەبەهەشت پێدا هاتەجێ لەغەزای -یەمامە- شەهید کرا. پێچەوانەیش نی‌یە لەگەڵ ئەو حەدیثەی کە دەلێ (ابو بكرٍ في الجنَّةِ وَعمرٌ في الجنَّة) چونکی کە باسی ئەو دوانەی کرد واتەی ئەوە نی‌یە کە زیاتریش لەوان ناچنە بەهەشت.

٩٢٧: عَنْ البَراءِ (ض) اِقرَأْ فُلانُ فانَّها السكينةُ تنزلَّتْ للقرآنِ.

### تەرجەمە

٩٢٧: دەگێڕنەوە لەبەرائی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بی گوتی ئوسەیدی کوڕی حضیر لەنوێژ سورەی -الکهف-ی دەخوێند بەشەو لەخانووی خۆی وولاغەکەشی لەوێ بو دەرەوییەوە دیتی تەمێکی سپی هات ژووری خانوەکەی داپۆشی ئوسەیدیش سەلامی دوە لەنوێژ دەرچوو پاشان ئەمەی بەپێغەمبەر گوت. پێغەمبەر (د) فەرمووی دەبوایە بەردەوام بی لەسەر خوێندنی قورئان لەنوێژ دەرنەچووبای ئەم تەمە تۆ دیتت ئەمە سەکینەیە هەوایەکی نەرمە ڕووی وەکوو ڕووی انسانە لەبەر قورئان هاتبووە خوارێ.

(ش): لەهەندێ گێڕانەوەی تر لەم حەدیثە لەنێو تەمە سپیەکە چەند قندیلی بەشەوق هەبوو ئەم تەرزە دیاردانە ئەگەرچی بۆ پێغەمبەر (د) موعجیزەنە بەڵام بۆ یارانی پیرۆزی ئەو کەراماتن.

**٩٢٨: عَنْ ابنِ عَبّاس (ض) لابأسَ طَهورٌ اِنشاءَ اللّهُ فقالَ فَنَعَمْ اِذاً.**

### تەرجەمە

٩٢٨: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عباس ڕەزای خودایان لێ بی پێغەمبەر (د) بۆ سەرلێدانی نەخۆش چووە لای عەرەبێکی بادیەنشین بەڕواڵەت موسولمان بوو. عادەتی پێغەمبەریش وابوو وەکوو بچوایە سەر نەساغان دەی فەرمووو (**لابأسَ طَهورٌ اِنشاء الله**) یەعنی قەیناکا ئەم نەساغیە پاک کەرەوەی تۆیە لەگوناە کەفارەی گوناهانە. لای عەرەبەکەش (کە قەیسی کوڕی أبو حازم بوو) وای فەرموو لەسەر عادەتی خۆی عەرەبەکە گوتی تۆ گوتت -طهور انشاء الله- بەڵام وانییە بەڵکی تایێکە گەرمایییەکەی جۆشیداوە جەستەی پیرەمێردێکی گەورەی بەتەمەن. زیارەتی قەبرانی پێ دەکا. پێغەمبەریش (د) فەرمووی مادام بەدوعایەکەی من ڕازی نی بابەقسەی تۆ بێ. ئنجا عەرەبکە نەگەیشتە سبەینە مرد.

**٩٢٩: عَنْ جابر (ض) هَلْ لَكُمْ مِنْ اَنماطٍ قُلْتُ واَنّى يكونُ لنا الأنماطُ قالَ أما اِنَّهُ سيكونُ لكُم الأنماطُ.**

### تەرجەمە

٩٢٩: دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودایان لێ بی گوتی

وەکوو ژنم هێنا پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەرێ خالیچەکانی بەرپشوەو جوانتان نی‌یە منیش پێم گوت خالیچەمان لەکوێ بوو. فەرمووی باش ئاگاداربە لەمەپاش خالیچەکانی بەرپشوەو ڕەنگاوڕەنگتان دەبی. (ش): ئنجا بەڕاستی فەرموودەی پێغەمبەر (د) هاتەجێ خالیچەی ڕازاوەو بەرپشوەمان ئەمەندە بوو بەئافرەتەکەی خۆم دەگوت ئەم خالیچانەی خۆت لەمن دوور بخەوە زۆر مەیلم لەگەڵیان نایێ.

ئافرەتەکەشم لەوەڵامی من دەیگوت وای لەبەر ئەم موعجیزە گەورەیە ئەدی پێغەمبەر (د) بەتۆی نەگوت بەڕاستی بۆ ئێوە خالیچە زۆر دەبێ مادام ئەو وای فەرمووە من هەلیان ناگرم دەبی هەموو کات ڕابخرێن وەکوو ئەم وەلامەی دامەوە -قسەم نەکرد ئیتر هەمووکات ڕاخرا.

٩٣٠: عَنْ عبدالله ابن عُمر (ض) رأيْتُ الناسَ مجتمعينَ في صَعيدٍ فقامَ ابو بكرٍ فَنَزَع ذَنوباً او ذَنوبَيْنِ وفي بَعْضِ نزْعِهِ ضُعْفٌ وَاللّهُ يَغفِرُ لَهُ. ثمَّ اَخَذَها عُمَرُ فاستحالتْ بيدهِ غَرباً فَلَمْ اَرَ عَبقَرِيّاً في النَّاسِ يَفري فَرِيَّهُ حتّى ضَرَبَ الناسُ بِعَطَنٍ.

## تەرجەمە

٩٣٠: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی لەخەو چاووم بەخەڵک کەوت بەگردەواری لەدەشتێک پاشان ئەبو بەکر هەلستا دەولکێک یا دوو دەولک ئاوی لەبیر هەلێنجا وە لەهەندێ هەلێنجانی دەولکەکەی زەعیفیێک هەبوو خودا لێی خۆش دەبی. پاشان عومەر دەولەکەکەی لێ وەرگرت ئەم دەولکەی کە بۆ یەک پیاو دەشا گەرا بەدەولکێکی زۆر گەورەی کە لەوەدا نەبوو بە پیاوێک هەلبگیرێ ئنجا ئەم دیت هیچ هێزدارێک و گەورە پیاوێک لەوکاری عومەر کردی بیکا هەتا خەڵک هەموو تێر ئاوبوون ووشترەکانی خۆیشیان تێر ئاوکردو هەموویان یخ کردن و مۆلگەشیان لە دەورەی ئاو بۆ سازدان هەتا هەرکاتێک ئارەزووی ئاویان کرد ئاو بخۆنەوە تینوو نەبن.

(ش): ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (د) چونکی بەڕاستی خەلافەتی حەزرەتی ئەبوو بەکر تەنیا دووساڵ و شتێک بوو لەبەر ئەمەش کە ماوەی خەلیفایەتی کەم بوو خەریک بە ئیصلاحی ئەهلی ڕە دەبوو نەی توانی وولاتی ئیسلام فرەوان بکا بەلام دەولکی خەلیفایەتی کە کەوتە دەست حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی وولاتەکانی کیسری و مصرو شام و عیراق و عەجەم بە تەرزێکی وای فەتح کرد لەو کاتەوە تاوەکوو ئێستا عالەم تیا سەری سوڕ دەمینێ.

٩٣١: عَن أُمِّ سلَمةَ (ض) مَنْ هذا قالَتْ هذا دَحْيَةُ وكانَ جبريلَ عليه السلام.

### تەرجەمە

٩٣١: دەگێڕنەوە لەئوسامەی کوری زەید ڕەزای خودایان لێ بی گوتی بەڕاستی حەزرەتی جوبرائیل سەلامی خوای لێ بی هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) ئومی سەلەمەی ئیکی ئیماندارانی لەلابوو ناوی هیند بوو کچی ئەبو ئومەیە بوو ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەریش (د) یەکسەر بەئومی سەلەمەی گوت ئەم پیاوە کێ بوو گوتی ئەمە دەحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبی بوو پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەمە جبرائیل بوو ئومی سەلەمە گوتی سوێندم بەخودا لام وابوو ئەمە دەحیەیە.

٩٣٢: عَنْ ابنِ عُمَرَ (ض) ماتجِدونَ في التَّوراتِ في شأنِ الرَّجْمِ.

### تەرجەمە

٩٣٢: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی جوولەکە هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتیان پیاوێک و ژنێک لەئێمە زینایان کردووە پێغەمبەر فەرمووی دەرحەق بەڕەجم لەتەورات چیتان لێ دیارە مەبەستی پێغەمبەر (د) بەتەورات بیان بەستیتەوە کە ئەوان باوەڕیان پێ هەیە گوتیان ئابڕوویان دەبەین لەناو خەڵک بە مەشهورکردنی عەیبەکانیان وە سەد داریشیان لێ دەدرێ. عبدالله کوڕی سەلامی خەزرەجی کە لە ئەولادی حەزرەتی یوسف بوو سەلامی خوای لێ بی گوتی درۆتان کرد گوتی حوکمی زینا لەتەورات (ڕەجمە). پاشان تەوراتیان هینا پانیان کردەوە یەکێک لە جوولەکە دەستی لەسەر ئایەتی ڕەجم دانا. پاش و پێش ئایەتەکەی خوێندەوە عبدالله فەرمووی دەستت هەلگرە دەستی هەلگرت دیتییان ئایەتی ڕەجم لەوێ بوو. گوتیان ڕاستی گوت عبدالله ئایەتی ڕەجمی تیا بوو پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەبێ ڕەجم بکرێن. ئنجا بانگی چوار شاهیدیان کرد کە ئالەتی زانیان لەنێو فەرجی زانیەدا دیتبوو لەپاش شاهێدی دان بەفەرمانی پێغەمبەر (د) ڕەجم کران.

(موتەرجم): لەمە زاندرا کە کافریش موکەلەفن بەفروعی شەرع.

٩٣٣: عَنْ ابنِ مسعود (ض) اِشهدوا اِنشقَّ القَمَرُ شِقَّيْنِ.

### تەرجەمە

٩٣٣: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بی لەزەمانی هەبوونی پێغەمبەر (د) بەموعجیزەیەک بۆ پێغەمبەر مانگ شەق بوو گەرا بەدوولەت. ئنجا پێغەمبەر (د) بەو جەماعەتەی گوت کە لەوێ بوون شاهێدبن.

(ش): بۆچی فەرمووی شاهید بن چونکی ئەمە موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە هیچ مناسبەی لەگەڵ موعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرەکانی تر نی‌یە. وەکوو ئەبو جەهل ئەمەی چاو پێ کەوت گوتی ئەمە سیحری محمدە بۆیێ ئەم ئایەتە هاتە خوارێ (**وَاِنْ يَروا اٰيَةً يُعْرِضوا ويقولوا سِحرٌ مستمرٌ**) لەپاشانیش وەکوو خەڵک لەهەموو ئەترافێک هاتن خەبەری لەت بوونی مانگیان بەخەڵکی مەکە گەیاند. بەم تەرزە گوتیان ئێمە دیتمان مانگ بووە دووپارچە.

## باب فضائل اصحاب رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم
## باسی صفەتە باشەکانی یارانی پێغەمبەر دروودی خوایان لەسەر بی

٩٣٤: عَنْ جُبَيرْ (ض) اِنْ لَمْ تجِدْني فأتِ ابابكْرٍ.

### تەرجەمە

٩٣٤: دەگێڕنەوە لەجوبەیری کوری موطعیم ڕەزای خودای لێ بی. گوتی ژنێک هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) ئیشێکی هەبوو پێ‌ی بلێ. پاشان وەکوو هەڵستا بڕوا پێغەمبەر (د) فەرمووی بگەڕێوە. ژنەکەیش گوتی تۆ پێم بلێ ئەگەر من بۆ خدمەت تۆ بێم و تۆش نەبینم (یەعنی لەپاش وەفاتی تۆ من چی بکەم) پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر منت نەدیت وەرە لای ئەبو بەکر ڕەزای خودای لێ بی. (ش): لەم حەدیثە نیشارە هەیە کە لەپاش پێغەمبەر (د) ئەبو بەکر خەلیفەیە. ئەوە وەنەبێ یەک نەگرتەوە لەگەڵ قسەی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی کە پێغەمبەر (د) هیچ فەرمانێکی نەفەرمووە بەوەی کە یەکێک لەدوای خۆی دانێ وە لەهەموو یارانی پێغەمبەریش گەورەترە. وە ئەوەش دەگەیەنی کە موعجیزەی پێغەمبەر بێ. چونکی لەپاش پێغەمبەر (د) خەلیفایەتی بۆ حەزرەتی ئەبو بەکر بوو- کە نازناوی (صدیق) بوو ڕەزای خودای لێ بی.

٩٣٥: عَنْ اَبي الدّرداء (ض) اَمّا صاحِبكُمْ فَقَدْ غامَرَ يغفِرِ اللّهُ لَكَ يا ابابكرٍ ثلاثاً.

انَّ اللّهَ بَعَثني اليكُمْ فقلتُم كَذَبْتَ. وقالَ. ابوبكرٍ. صدَقَ. وواساني بنفسِهِ وَمالِهِ فهَلْ انتُمْ تارِكوا لي صاحبي مرّتَيْنِ فما أوذيَ بَعْدَها.

## تەرجەمە

٩٣٥: دەگێڕنەوە لەئەبو الدرداءی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی گوتی دانیشتبوم لەخدمەت پێغەمبەر (د) لەناکاو حەزرەتی ئەبو بەکر هات خۆی هەلکردبوو هەتا بەشێوەیەک چۆکی دیاربوو. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەما ڕەفیقەکەتان موخاصەمەی کردووە (واتا ناخۆشی‌یەکی بووە لەگەلّ یەکێکی تر) ئەبو بەکر پێی گوت من و کوڕی خەطاب گفتوگۆیەکمان بوو منیش قسەی توندم لەگەلّ کرد. لەپاشان پەشیمان بوومەوە داوام لێ کرد عەفووم بکا لەقسەکەی توندم عەفووی نەکردم ئنجا هاتوومە خدمەت تۆ. پێغەمبەر (د) فەرمووی سێ جار خودا لەتۆ خۆش دەبی عەفووت دەکا. پاشان حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی لەعەفوو نەکردنەکەی پەشیمان بۆوە چووە قۆناغی حەزرەتی ئەبو بەکر ڕەزای خودای لێ بی پرسی ئەرێ ئەبو بەکر لەمالّە وەلامیان داوە لەمالّ نی‌یە ئنجا چووە خدمەت پێغەمبەر (د) سەلامی کرد دیتی پێغەمبەر (د) ڕوویی پیرۆزی زۆر گرژبووە لەرکان هەتا حەزرەتی ئەبو بکر ترسا کە حەزرەتی عومەر لەلایەن پێغەمبەرەوە دلّ شکانێکی پێ بگا. لەبەر مەرحەمەت بەحالّی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی هەلّستا چووە خدمەت پێغەمبەر (د) لەسەر چۆک دانیشت دووجار پێی گوت من ستەمم لەعومەر کرد. پاشان پێغەمبەر فەرمووی بەڕاستی خودا منی نارد بۆلای ئێوە بەپێغەمبەرایەتی. ئێوەش پێشدان بەمنتان گوت درۆ دەکەی. ئەبو بەکریش گوتی ڕاست دەکەی پاشان منی لاواندەوە واتا دلّی دامەوە بەڕووحی خۆیو بەمالّی خۆی. ئەرێ ئنجا ئێوە واز لەهەوالّەکەی من نایێن دووجار ئەم قسەیە لەلێوی دوڕ نشاری جاری بوو ئیتر پاش ئەم جارە جارێکی تر دلّی حەزرەتی ئەبو بکر عاجز نەکرا لەبەر ئەم تەعظیمەی پێغەمبەر.

(تەماشاکە مەرحەمەتی ئیمانداران بەیەکتریان وا دەبێ بزانە لەسەر عەفووکردنێک چە کارەساتێکیان کرد).

٩٣٦: عَنْ عمرو ابن العاصَ (ض) قُلتُ اَيَ النّاس اَحَبُّ اِلَيْكَ قالَ عائِشَةُ فقُلْتُ منَ الرِّجالِ فقالَ ابوها فَقُلْتُ ثمَّ مَنْ قالَ ثُمَّ عُمَرَ ابن الخطّاب فَعَدَّ رجالاً.

## تەرجەمە

٩٣٦: دەگێرنەوە لە عەمری کوری عاص گوتی پێغەمبەر (د) منی گێرا بەسەرکردەی لەشکر لەغەزای ذات السلال حەزرەتی ئەبو بکرو عومەریش لەناو لەشکرەکە دابوون منیش بەدڵم دا هات ممکنە پێغەمبەر (د) منی لەئەبو بکرو عومەر خۆشتر بوێ بۆیێ منی کردە سەرکردە لەسەر لەشکر کە ئەوانیش لەگەڵ دانە. ئنجا وەکوو هاتینەوە لەغەزا چوومە خدمەتی پێم گوت کێت لەهەمووکەس خۆشتر دەوێ فەرمووی عائشە. پێم گوت لەپیاوان فەرمووی باوکی عائشە کە ئەبو بکرە پێم گوت لەپاش ئەو فەرمووی عومەری کوری خەطاب. چەند پیاوێکی تریشی فەرموو. منیش هیچ قسەم نەکرد ترسام نەوەک بمخاتە ئاخیری هەموویان ئەمە لەساڵی حەوتەمی کۆچی بوو.

(ئنجا بەمە بزانە کاروباری پێغەمبەر هەمووی لەژێر فەرمان و ویستی خودا بووە. لەخۆرا نەبووە).

٩٣٧: عَن عبدالله ابن عُمر (ض) مَن جَرَّ ثَوْبَهُ خُيلاءَ لَمْ ينظر اللّهُ اليه يومَ القيامَة. فقالَ ابوبكر انَّ اَحدَ شِقَيْ ثَوبي يَسْتَرْخي اِلاَّ اَنْ اَتعاهَدَ ذلِكَ مِنْهُ. فقالَ اِنَّكَ لسْتَ تصنَعُ ذلِك خيلاءَ.

## تەرجەمە

٩٣٧: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوری حەزرەتی عومەر رەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسی دامەنی شمەکی خۆی بەشانازی و افتخار رابکێشی لەسەر عارد خودا بەچاوی رەحمەت تەماشای ناکا رۆژی قیامەت. حەزرەتی ئەبو بەکر فەرمووی. منیش لەشمەکی خۆم لا دامەنێکم لەسەر عارد دەخشێ ئەگەر هەلی نەکەم فەرمووی وانییە تۆ لەبەر شانازی بەخۆکردن شمەکی خۆت لەسەر عارد رابکێشی.

(ش): بەبێ مەبەستی شانازی بەخۆکردن ئەگەر کەسێک شمەکی ئەوی لەبەری دەکا درێژبی بکەویتە سەر عارد عەیبی تێدا نییە بەڵام پەسند نییە و مەکروهە. هەندێ دەڵێن حەرامە هەندێکیش بەحەرامی نازانن.

٩٣٨: عَن اَبي سعيدٍ (ض) لاتَسُبّو اَصحابي فَلَوْ اَنَّ اَحَدَكُمْ اَنفقَ مِثْلَ اُحُدٍ ذَهباً مابَلَغَ مُدَّ اَحَدِهِمْ وَلا نصيفَهُ.

## تەرجەمە

٩٣٨: دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی جنێو بەیاران و ئەصحابی من مەددن. چونکی ئەگەر یەکێک لەئێوە لەڕێگای خودا هەندەی کێوی ئوحود زێڕ بکاتە خێر ناکاتە یەک مستی یارانی من لەپاداشت.

**٩٣٩: عَن اَبي موسى (ض) قالَ فَقُلْتُ يارسولَ اللّه هذا ابو بكرٍ يَستأذِنُ فقال ائذَنْ لَهُ وبَشّرهُ بالجَنَّةِ. فقُلتُ هذا عُمَرُ. فقالَ إئذنْ لَهُ وبَشّرهُ بالجَنَّةِ. فجاءَ عثمانُ فأخبَرْتُهُ فقالَ ائذَنْ لَهُ وَبَشّرهُ بالجَنَّةِ على بَلوى تصيبُهُ وَهوَ جالِسٌ على بئرِ اَريسٍ وَتوسَّطْ قُفّها.**

## تەرجەمە

٩٣٩: دەگێڕنەوە لەئەبو موسی عبداللەی کوڕی قەیسی ئەشعەری ڕەزای خودایان لێ بی. گوتی لەمالّی خۆم دەست نوێژم شوشت هاتمە دەرێ بەم نیەتە کە ئیمرۆ بەتەواوی لەخدمەت پێغەمبەر (د) جودا نەبمەوە. منیش چوومە مزگەوت پسیارم کرد لە پێغەمبەر (د) گوتیان دەرچوە واوە ڕۆیی منیش کەوتمە شوێنی هەر پسیارم دەکرد هەتا لەباغی ئەریس لەنزیک قوبا دۆزیمەوە. فەرمانی بەمن کرد ئەی ئەبا موسێ لەدەرگای باغ دانیشە منیش لەدەرگای باغ دانیشتم دەرگاکەشی لە خورمابوو. هەتا نیشی خۆی پێک هێنا وە دەست نوێژی شوشت چوومە خدمەتی دیتم لەسەر لێوی بیر دانیشتووە قاچەکانی پیرۆزی خۆی هەلّکردووە شۆڕی کردووتەوە نێو بیر چونکی گەرمابوو سەلامم لێ کرد پاشان گەڕامەوە لەدەرگای باغ دانیشتم لەدلّی خۆم گوتم ئیمرۆ من دەبمە دەرگەوانی پێغەمبەر (د). دیتم ئەبو بەکر هات بۆ ئیزن وەرگرتن لەدەرگەی دا منیش گوتم ئەمە کێیە گوتی ئەبو بەکرم گوتم ڕاوەستە. ئەختێک چوومە خدمەت پێغەمبەر (د) پێم گوت ئەبو بەکر ئیزن دەخوازتەوە بێتە ژوورێ فەرمووی ئیزنی بدە موژدەشی پێ بدە بەچوونە ناو بەهەشت. گەڕامەوە لای ئەبو بەکر گوتم وەرە ژوورێ موژدەشت پێ دەدا بەبەهەشت هاتە ژووری لەلای ڕاستی پێغەمبەر دانیشت لەسەر لێوی بیر قاچیشی شۆڕکردەوە لەبەر ڕێک کەوتن بەلاّم قاچەکانی زیاتر هەلکرد نەوەک پێغەمبەر شەرمێک بکاو حەسانەوەی تێک بچی. پاشان گەڕامەوە دەرگای باغ دانیشتم. منیش پێشتر برایەکانی خۆم عامری ئەبو بوردە وە ئەبو ڕەهەمم جێ هێشت بوون بۆ دەست نوێژ شووشتنیان پاشان بەمن بگەن هەر لەدلّی خۆم دەم گوت ئەگەر خودا ویستی چاکەی لەگەلّ برایەکانم هەبێ دەیان هێنی دیتم یەکێک

دەرگایەکە دەجوولێنی گوتم کێیە گوتی عومەری کوڕی خەطابە گوتم نەختێ ڕاوەستە بەنازایی چوومە خدمەت پێغەمبەر (د) سەلامم کرد پێم گوت عومەری کوری خەطاب داوای ئیزن وەرگرتن دەکات. فەرمووی ئیزنی بدە موژدەشی پێ بدە بەبەهەشت هاتمەوە لای عومەر گوتم وەرە ژوورێ موژدەی بەهەشتیشی پێ دای هاتە ژوورێ چوو لەلای چەپی پێغەمبەر (د) دانیشت ئەویش قاچی شۆڕکردەوە نێوبیر منیش گەڕامەوە دەرگا هەر دەمگوت ئەگەر خودا ئیرادەی خێری بەبرایەکانم هەبوایە دەی هێنان دیتم مرۆڤێک دەرگا دەجولێنێ گوتم کێیە گوتی عوثمانە گوتم نەختێ ڕاوەستە. چوومە خدمەت پێغەمبەر (د) پێم گوت عوثمان داوای ئیزن وەرگرتن دەکات کە بێتە ژوورەوە فەرمووی ئیزنی بدە موژدەشی پێ بدە بەبەهەشت لەگەڵ بەلاو کارەسات. هاتمەوە لای عوثمان گوتم وەرە ژوورێ موژدەشت لێ بێ بەبەهەشت لەگەڵ بەلاو کارەسات کە تووشت دەبی. هاتە ژوورێ ئەویش وەکوو ئەوان لەسەر لێوی بیر قاچی شۆڕکردەوە بەهەر چواریان دەورەی لێوی بیر پڕبۆوە عوثمان کەوتە لای بەرامبەر پێغەمبەر (د) دانیشت.

(ش): هەندێ لەزانایان کۆبوونەوەی ئەبو بەکرو عومەر ڕەزای خوایان لێ بی و هەلکەوتنی عوثمان لەبەرامبەری پێغەمبەر (د) وایان لێک داودتەوە بەکۆبوونەوەدو بەرامبەری یەک لەشوێنە پیرۆزەکان ئەوها قەبرەکانیان هەلکەوتووە چونکی قەبری ئەبو بەکرو عومەر لەژووری پێغەمبەرن. قەبری حەزرەتی عوثمان لەبەقیعە بەرامبەری حوجرەی رۆناکی قەبری رۆناکی قەبری پێغەمبەر (د). ئیمامی نەوەویش گوتیتی ئەم خەیاڵە لەزیرەکییەکی ڕاستەوەیە.

٩٤٠: عَنْ اَنَسٍ (ض) اُثْبُتْ أُحُدُ فانَّما عَلَيْكَ نبِيٌّ وَصِدّيقٌ وَشهيدان.

## تەرجەمە

٩٤٠: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوری مالک ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) بەسەرکێوی ئوحود کەوت حەزرەتی ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانی لەلابوو کێو لەژێریان لەرزی پێغەمبەر (د) فەرمووی مەجوولێ ئەی ئوحود بەڕاستی ئەمانەی لەسەر تۆن پێغەمبەرێکەو ڕاست گۆیێک و دوو شەهیدن.

(ش): ابن منیر گوتیتی حیکمەتی ئەم قسە لەگەڵ کردنەی پێغەمبەر (د) لەگەڵ

نوحود ڕۆن کردنەوەی ئەمەبووە کە ئەم هەژانەی نوحود وەکوو هەژانی کێوی قەومی موسی نی‌یە کەلەبەر ڕک لێ بوونەوەبوو بەڵکی ئەمەیان هەژانی کێوی نوحود لەکەیفانە. لەبەر هەبوونی ئەو پیاوە گەورانە لەسەر ئەو. هەژانەکەی لەبەر کەیف خۆشی و بەزم بوو بۆیێ باسی پێغەمبەرایەتی و ڕاست گۆیی و شەهید بوونی فەرمووە تا دڵی خۆشتر بێ و هێمن بێ. ئنجا هێمن بوو. چەند شیرینی گوتووە ئەو کەسەی بەعەرەبی گوتوویە:

**(وَمــــالَ حِــــراءُ تَحــــتَــــهُ فَــــرَحــــاً بِـهِ**
**فلولا مـــقـــالُ اسكنْ تضَنــعــضَعَ وانقــضــا).**

واتاکەی: کێو لەژێر پێی دەهات و دەچوو لەکەیفان ئەگەر ووشەی -اسکن- واتە هێمن بەنەبوایە لەباڵ یەک دەردەهات و لەناو دەچوو.

٩٤١: عَنْ ابنِ عَباس (ض) عَن عليٍّ (ض) كنتُ وابوبَكْرٍ وَعُمَرُ وَفعلْتُ وَابوبَكرٍ وَعُمَرُ. وانّي كثيراً ماكنْتُ اسْمَعُ يقولُهُ.

**تەرجەمە**

٩٤١: دەگێڕنەوە لەعەبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودایان لێ بی گوتی لەکاتی شەهید بوونی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی لەناو کۆمەڵێک خەڵک ڕاوەستابووم دوعاو پاڕانەوەیان بۆ حەزرەتی عومەر دەکرد کە لەنێو دارەمەیت داندرابوو. دیتم پیاوێک لەلای پشتەوەم هەنیشکی لەسەر شانی من دانا: دەیگوت ڕەحمەتی خودات لێ بی بەڕاستی من ئومێدو ڕجام هەر هەبوو کە کۆبیی‌یەوە لەگەڵ هەردوو ڕەفیقەکانت. چونکی زۆرجار گوێم لێ دەبوو پێغەمبەر (د) لەکاتی ژیانی خۆی دەی فەرموو. من و ئەبوبەکرو عومەر بووین فلان نیشم کرد وە ئەبو بەکرو عومەریش کردیان وە من و ئەبو بەکرو عومەر چووینە فلان جێگا وە من لەبەر ئەم تەرزە قسانە ئومێدم هەبوو لەپاش وەفاتیش خودا لەگەڵ ئەوانت کۆبکاتەوە پاشان وەکوو ئاوڕم دایەوە دیتم عەلی کوڕی ئەبو طالب ئەم قسانە دەکا.

## باب فضائل الاصحاب المهاجرين
## (باسی چاكەكانی یارانی كۆچ كردوو)

### باب فضائل عمر رضي الله عنه
### (باسی چاكەكانی عومەر ڕەزای خودای لێ بی)

٩٤٢: عَن جابرٍ (ض) رأيْتُني دَخَلْتُ الجنَّةَ فاذا أنا بالرُّميصاءِ إمرَأةِ أبي طَلْحَةَ وَسَمعْتُ خَشْفَةً فَقُلْتُ مَنْ هذا. فقالَ هذا بِلالٌ وَرَأيْتُ قَصْراً بِفَنائِهِ جارِيَةٌ فَقُلْتُ لِمَنْ هذا فقالَ لِعُمَرَ فأرَدْتُ أنْ أدخُلَهُ فانظُر إلَيْه فَذَكَرْتُ غيرَتَكَ فقالَ عُمَرُ بأبي وَأمّي يارسولَ اللّهِ أعَلَيْكَ أغارُ.

#### تەرجەمە

٩٤٢: دەگێڕنەوە لەجابر كوڕی عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی خۆم دیت لەخەو چوومە ناو بەهەشت لەناكاو دیتم چاو بەجیقەكەی ژنی ئەبو طەلحە كەناوی (سەهەلەی كچی مەلحانی ئەنصاریە بوو) لەوێ بوو و گوێم لەدەنگی قاچیشی بوو لەشەقاو هاوێشتن گوتم ئەمە كێیە جوبرائیل گوتی ئەمە بلالەو قەصرێكیشم دیت لەدەرەوەی قەسەرەكە جاریەیەک ڕاوەستاوە. گوتم ئەم قەسرە ئی كێیە جوبرائیل گوتی ئەمە قەسری عومەرە ویستم بچمە ناو قەسرەكە تەماشایەكی بكەم پاشان غیرەتی تۆ دەرحەق بەناموس و ئافرەتان كەوتەوە یادم ئەی عومەر نەچووم. حەزرەتی عومەر گوتی باوک و دایكم بەفیدات بی ئەی پێغەمبەری خودا چما دەبی لەسەر تۆیش غیرەت بنوێنم.

٩٤٣: عَنْ أنَسٍ (ض) وَما أعْدَدْتَ لها. قالَ لاشئَ إلاّ أنّي أحِبُّ اللّهَ وَرَسولَهُ صلى الله تعالى عليه وسلم. فقالَ أنتَ مَعَ مَنْ أحْبَبْتَ.

#### تەرجەمە

٩٤٣: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی ئەبو الخویصرە هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) پێی گوت قیامەت كەی دادێ پێغەمبەر (د) فەرمووی چیت بۆ قیامەت

حازرکردووه گوتی هیچم حازر نەکردووه نەمەندە نەبێ خوداو پێغەمبەری خودام خۆشدەوێ. پێغەمبەریش (د) فەرمووی تۆ لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشت ویستی‌یە لەبەهەشت بە لەگەڵ یەکدابوونەکی وا کە هەرکات یەکتر ببینن و گوێتان لەقسەی یەکتریتان ببێ با جێگاشتان لەیەکتر زۆر دووربێ. چونکی وەکوو هیچ پەردەو کۆسپەیەکی شوێنی و کاتی نەما دیتن و بیستن دەبێ هەروەکوو نموونەیەکی ئەم حەدیثە پیرۆزە ئێستا لەئەوروپا هەیە یەعنی لەساڵی ١٣٧١ کۆچی کە دەکاتە ساڵی ١٩٥١ زاینی کاتی نووسینەوەی ئەم کتێبە. بەهۆی تەلەفۆن لە مەسافەیەکی دوورەوە کەچی باش گوێیان لەقسەی یەکتری دەبێ و باشیش یەکتری دەبینن ئنجا بەگوێرەی ئەو قسەی کە دەڵێ (الدنیا مرآة الاخرة) واتا دونیا ئاوێنەی ڕۆژی قیامەتە. بۆ کەسێک خاوەنی هۆش و پەند وەرگرتن بێ لەئاوێنەی دونیا هەموو کاروباری ڕۆژی دوایی دەبینی.

٩٤٤: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لَقَدْ كانَ فيما قبلكُمْ مِنْ بني اسرائيلَ رجالٌ يكلَّمونَ مِن غير ان يكونوا اَنبياءَ. فأنْ يَكُ مِن أُمَّتي اَحَدٌ مِنْهُمْ فَعُمَرُ.

### تەرجەمە

٩٤٤: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بێ. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی لەعالەمی پێش ئێوە لەبەنی ئیسرائیل چەند پیاوێک هەبوون قسەیان لەگەڵ دەکرا لەلایەن مەلائکە کە پێغەمبەریش نەبوون ئەگەر لەئومەتی من یەکێک هەبێ لەوان بێ عومەر لەوانە.

## مناقب عثمان رضي الله عنه
## (چاکەکانی عوسمان ڕەزای خودای لێ بێ)

٩٤٥: عَنْ ابنِ عُمَرَ (ض) اِنَّ لَكَ اَجْرَ رَجُلٍ مِمَّن شهِدَ بَدْراً وَسَهْمَهُ هذه يَدُ عثمان فَضَرَبَ بها على يَدِهِ فقالَ هذا لِعثمانَ.

### تەرجەمە

٩٤٥: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بێ گوتی پیاوێکی خەڵکی مصر بۆ حەج هەتبیر گوتراوە (یەزیدی کوڕی بشری سەکسەکی بوو).

بەمنی گوت ئەرێ دەزانی عوسمان لەغەزای ئوحود فیراری کرد گوتم (ئا) گوتی دەزانی لەغەزای بەدریش خۆی بزرکرد گوتم (ئا) گوتی دەزانی لە (بیعە الرضوان)یش لەحودەیبیە خۆی بزرکرد حازرنەبوو گوتم (ئا). پیاوەکەی مصری لەدڵخۆشیان چونکی عبداللە هەموو قسەکانی تەصدیق کردو گوتی ئا راستە کابرا گوتی «اللە اکبر». عبداللە بانگی کرد گوتی وەرە هەتا ئەم سێ ماددەیەت بەدرێژی بۆ باس بکەم. (یەکێیان) فیراری ئیمامی عوسمان لەغەزای ئوحود بەڕاستی خودا عەفووی کردو لێی خۆش بوو ئایەتی **(وَلَقَد عفا اللّٰه عنهم ان الله غفور رحیم)** دەرحەق بەو هاتە خوارێ (دووەم): بزربوون لەغەزای بەدر: لەبەر ئەمەبوو روقیەی کچی پێغەمبەر (د) فەرمانی پێ کرد پێی فەرموو لەگەڵ ئوسامەی زەیدی کوڕی حارثە بمێنێنەوە بۆ بەدر نەچن (ئنجا لەو نەساغییە وەفاتی کرد هەتا ئەو رادەیەی وەکوو زەیدی کوڕی حارثە لەپاش سەرکەوتنی یارانی پێغەمبەر لەم شەڕە کە شەڕی بەدربوو بۆ موژدەو بەشارەت هاتەوە مەدینە روقیە لەتەمەنی بیستساڵی وەفاتی کرد). بەڕاستی پێغەمبەر (د) بەرەو ڕو بەعوسمانی گوت (بێ شک بۆتۆ پاداشتی پیاوێکت هەیە لەوانەی کە حازری غەزای بەدر بوون لەڕۆژی دوایی. وە بۆ کەلکی دونیاش بەشی پیاوێکت لەوان هەیە لەتاڵانی کافران). (سێیەم): دیارنەبوونی عوسمان لە **(بیعة الرضوان)** ئەمەبوو: پێغەمبەر (د) ئەوی هەڵبژارد کە بینێرێ بۆ مەککە پێیان بلێ ئێمە بۆ عومرە هاتووینە بۆ شەڕ نەهاتووینە موحەقەق -واتە بێ گومان- ئەگەر کەسێکی تری لەعوسمان خۆشەویست تر هەبوایە ئەوی دەنارد بەڵام دەربارەی خۆی ئەوی هەڵبژارد کە بینێرێ. ئنجا لەکاتی دیارنەبوونی عوسمان. خەبەری ئەوەی کە کافرەکانی قورەیش دەیانەوێ شەڕ لەگەڵ موسولمانان بکەن بڵاوبۆوە پێش هاتنەوەی عوسمان لەمەککە. موسولمانیش خۆیان بۆ کوشتار ئامادەکرد. پێغەمبەریش بەیعەتی لەگەڵ ئەصحاب کرد. بەم تەرزە پەیمانی لەهەموویان وەرگرت کە فیرار نەکەن ئەم بەیعەتە لەژێر داربوو وەکوو دەلێ **(بایعوا نبینا تحت الشجرة)**. ئنجا چونکی عوسمان لەم بەیعەتە حازر نەبوو پێغەمبەر (د) دەستی ڕاستی پیرۆزی خۆی بلندکرد فەرمووی (ئەمە دەستی عوسمانە لەدەستەکەی چەپی دا فەرمووی ئەمەیش موبایەعەی عوسمانە). ئنجا لەبەر ئەم صفاتە باشانەی کە لە عوسمان هەبوو لەپاش وەفاتی (روقەیە) پێغەمبەر (د) کچی دووەمی خۆی (ام کلثومی) پێدا. بۆیێ ناسرابوو بەذوالنورین. ئنجا عبداللە بەپیاوەکەی مصری گوت بەوەلامی هەرسێ پرسیارەکانی خۆتەوە برۆ شوبهەو گومانت لەگەورەیی حەزرەتی عوسمان نەبێ: بەنەبوونی گومان بەدڵێکی پاک لێرە برۆ.

## فضائل الاصحاب المهاجرين
## (باسی چاکەکانی یارانی کۆچ کردوو)

### مناقب علي رضي الله عنه
### (چاکەکانی علی ڕەزای خودای لێ بی)

**٩٤٦: عَنْ عَليّ (ض) على مكانكما الا أعلمكما اَلا أعلمُكما خَيْراً مّما سئلتُماني إذا اَخذتُما مضاجعَكُما تُكبّرا أربعاً وثلاثينَ وَتُسَبّحا ثلاثاً وثلاثينَ تَحْمدا ثلاثاً وثلاثينَ فَهُوَ خيْرٌ لكما مِنْ خادِمٍ.**

**تەرجەمە**

٩٤٦: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی علی (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی حەزرەتی فاطمە سەلامی خوای لێ بی لەبەر دەستارلێ کردن دەستەکانی پیرۆزی تووشی ئازارو پۆرگ هات بەشکایەت لەحاڵی خۆی بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) چوو. بەئومێدی ئەمە چەند ئەسیرێکیش هەبوون بەڵکی ئەسیرێکی پێ ددبەخشرێ دەستاری پێ بهاڕی بەڵام پێغەمبەر (د) لەماڵ نەبوو قسەی خۆی لای حەزرەتی عائشە کرد. پێغەمبەر (د) وەکوو تەشریفی هاتەوە ماڵێ حەزرەتی عائشە. خەبەری پێدا کە فاطمە داوای خدمەتکارێک دەکا. حەزرەتی عەلی گوتی پێغەمبەر (د) تەشریفی هاتە ماڵەکەمان من و فاطمەش لەسەر عارد پاڵ کەوتبووین و ڕاکشابووین. من ویستم هەڵستم پێغەمبەر (د) فەرمووی شێوەی ڕاکشانتان تێک مەدەن هات لەبەینی هەردوومان دانیشت هەتا بەڕادەیەک ساردایی قاچی پیروزیم لەسەر سنگی خۆم هەست پێ کرد. فەرمووی ئاگاداربن شتێکی باشترتان فێردەکەم لەو شتی لێم داوا دەکەن کە حەزرەتی جبرەئیل فیری کردوومە. وەکوو شەو هاتنە سەر جێگای بۆ ڕاکشان سی و چوار جار بلێن (الله اكبر) وە سیوسێ جار بلێن (سبحان الله) وە سیوسێ جار بلێن (الحمد لله) ئەمە باشترە بۆ ئێوە لەخدمەتکارێک.

(ش): واو ئەمە ناگەینی لەدوو یەک بن کەوایە مخالف نی‌یە ئەم گێرانەوەیە کە تەسبیح بەپێش تەحمید دەخاو (تەکبیر) دوا دەخا لەهەردوویانیان تیا هەیە وە گێڕانی تەکبیریش بەسیوچوار بەو شێوەی زیادکردنی **(لا اله الا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شئٍ قدير)** ئەگەر نا هەر سی و سێیە. لەوانەشە ئەم ویردە (سکالایە) تایبەتبێ بەکاتی خەو.

## مناقب قرابة النبي صلى الله تعالى عليه وسلم
## باسی گەورەیی خزمی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ

٩٤٧: عَن عبدالله ابْن الزُّبير (ض) مَنْ يَأْتِ بني قُرَيْظَةَ فيأتيني بِخَبَرِهِمْ فانْطَلَقتُ فلَمّا رَجَعْتُ جمع لي بيْنَ اَبَوَيْهِ فقالَ فِداكَ اَبي وَاُمّي.

### تەرجەمە

٩٤٧: دەگێڕنەوە لەعبدالله کوری زوبیر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی لەخەندەق وەکوو قورەیش و عەشیرەتەکانی جۆراوجۆری عەرەب مەدینەیان دەورەدابوو من و عومەری کوڕی سەلەمەی کە پێغەمبەر خۆی بەخێوی کردبوو چونکە دایکی مارە کردبۆوە کە ئەویش (ئومی سەلەمە)ی دایکی ئیماندارانە. ئێمە هەردووکمان داندرابووین کە پارێزگاری لەژنە پاکەکانی پێغەمبەر بکەین دەمدیت زوبەیری باوکم بەسواری دوو یا سێ جار بۆ ناو بەنی قورەیظە دەچۆوەو دەگەڕاوە. وەکوو گەڕامەوە لای باوکم پێم گوت من تۆم دیت بۆ نێو بەنی قورەیظە دەرچووی و دەگەڕایەوە ئەمە چی بوو گوتی تۆ منت دیت گوتم (بەڵێ) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی کێ هەیە بۆ بەدیارخستنی ئەحوالات بچێتە نێو بەنی قورەیظە خەبەری ئەوانم بۆ بینی منیش هەڵستام.چووم خەبەری ئەوانم بۆ هێناوە پێغەمبەر فەرمووی باوک و دایکم بەقوربانت بی ئنجا لەمەدا گەورەیی‌یەکی زۆر هەیە بۆ زوبەیر.

(ش): زوبیر کوڕی عەوام کوڕی خویلد کوڕی ئەسەد کوڕی عبدالعزی کوڕی قوصەی کوڕی کلاب کوڕی مورە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی. لەقوصەی رەچەلەکی لەگەڵ پێغەمبەر دەگەنەوەیەک. لەناو خۆیا نسبەت وەباڵ ئەسەد دەدرا بەم تەرزە پێ‌یان دەگوت (القریش الاسدی) دایکیشی صەفیەی کچی عبدالمطلب بوو پووری پێغەمبەر بوو موسولمان بوو هیجرەتیشی کرد. زوبەیریش لەتەمەنی پازدە سالی موسولمان بوو لەغەزای یەرمووک بەشداربوو لەگەڵ عەمری کوڕی عاص لە فەتحی مصر بەشداربوو لەشەڕی (جەمەل) لەگەڵ حەزرەتی عائشە دابوو. لەگەڕانەوەی. لەوادی سباع شەهید کرا لەساڵی (٣٦) کۆچی.

٩٤٨: عَنِ المسْوَرِ ابنِ مَخرَمَة (ض) اَمّا بَعْدُ فاني انكَحْتُ ابا العاص ابنَ الرَّبيع مُحَدِثي وَصَدَقني وَاِنَّ فاطمةَ بَضْعَةٌ مِنّي واني اكرهُ اَنْ يَسوءَها واللهُ لاتجتمعُ بنت رسول الله (ص) وبنت عدوّ الله عند رجُلٍ واحِدٍ.

### تەرجەمە

٩٤٨: دەگێڕنەوە لەمسوردی کوڕی مەخرەمە. گوتی حەزرەتی عەلی جویرییەی کچی ئەبو جەهلی داخوازی کرد. حەزرەتی فاطمە پێی زانی چووە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی قەومی تۆ وا بیردەکەنەوە کە تۆ لەسەر کچەکانی خۆت ڕقی خۆت لەکەس ناکەیەوە با ئەزیەتیش بدرێن. ئەوا عەلی دەیەوێ کچی ئەبو جەهل مارەبکا. ئنجا پێغەمبەر (د) هەڵستا بەدواندەر (خطیب) لەپاش سوپاس و ستایشی خودا. فەرمووی من کچی گەورەی خۆم زەینەب لەئەبو العاص کوڕی ڕەبیع مارکرد لەپێش پێغەمبەرایەتی بەم مەرجە هیچ ژنی بەسەر نەینی بەڕاستی قسەی ڕاستی لەگەڵ من بڕییەوەو وەعدەی خۆیشی بەجێ گەیاند وە ئەم وەعدەیەم لەعەلیش وەرگرتوە بەلاّم ممکنە لەبیری نەماوە. وە فاطمەیش پارچەیەکە لەمن. وە بەبێ شک من پێم ناخۆشە کەسێک دڵی بشکێنێ- سوێندم بەخودا کچی پێغەمبەری خوداو کچی دوژمنی خودا لای یەک پیاو کۆنابنەوە. ئنجا حەزرەتی عەلی وازی لە داخوازیەکە هینا.

(ش): لای هەندێ زانایان گوتوویانە خودا لەحەزرەتی عەلی حەرام کرد ژن بەسەر فاطمەی کچی پێغەمبەر بینی لەبەر ئەم ئایەتە (وَما آتاكم الرَّسولُ فخذوهُ ومانهاكم عنه فانتهوا). ئەبو عەلی سەنجی گوتیتی لەشەرحی تەلخیص حەرامە ژن مارەکردن لەسەر کچانی پێغەمبەر (د).

٩٤٩: اِنْ تطعَنوا في أَمارَتِهِ فَقَدْ كنتُمْ تطعنونَ في أمارَةِ أَبيهِ مِنْ قبْلُ وَاَيْمُ اللّه اِنْ كانَ لخليقاً لِلأمارَةِ وَاِنْ كانَ لِمنْ اَحَبِّ النّاسِ اِليَّ. واِنَّ هذا لَمِن اَحبِّ النّاسِ اِليَّ بَعْدَهُ.

### تەرجەمە

٩٤٩: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەدوا ڕۆژانی ژیانی لەشکرێکی ڕێکخست بۆ ئەترافی ڕۆم لەژێر بەیداغ و سەرکردایەتی ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حارثە لەپاش شەهید بوونی باوکی لەغەزای مؤتە کە لەگەڵ جەعفەری ئەبو طالب وعبداللەی کوڕی ڕەواحە هەرسێیان شەهید کران لەمەیدان بەیەک سەعات لەتەمەنی هەژدە ساڵی کە لە گەورەکانی یارانی پێغەمبەریش زۆر لەگەڵدابوون وەکوو حەزرەتی ئەبوبکرو حەزرەتی عومەرو ئەوانی تریش وەکوو ئەبو عوبەیدەو سەعدو سەعیدو قەتادەی کوڕی نەعمان و سەلەمەی کوڕی ئەسلەم.

(عەیاشی کوڕی ئەبو رەبیعەی مەخزومی) بە طەعن گوتی چلۆن دەبی منالێکی وەکو ئوسامە هەڵبیژێردرێ بەسەرکردە لەسەر پیاوە گەورەکانی موهاجران بەشێکیش لەم طەعنە لای عەیاشیان گرت. قسەیان لێ کرد. حەزرەتی عومەر لەقسەکان هەندێکی بیست فەرمووی ووس بن قسە مەکەن. چووە خدمەت پێغەمبەر (د) خەبەری قسەی نارەزایی و طەعنی پێدا. پێغەمبەر (د) زۆر ڕقی بۆوە هەڵستا بەدواندەر (خطیب) فەرمووی ئەم طەعنەتان دەرحەق بەباوکی ئوسامەیش هەبوو. وەکوو کرا بەسەرۆکی لەشکری غەزای مۆتە لەمەپێش کە زەیدی باوکی ئوسامەیش والله بەڕاستی لایق بوو بۆ سەرۆکایەتی. وە لەخۆشەویست ترینی خەڵکیش بوو لای من. وە بەڕاستی ئەو ئوسامەیش خۆشەویست ترینی خەڵکە لای من لەپاش باوکی.

(ش): ئنجا بەڕاستی ئەگەرچی پێغەمبەر (د) لەژیانی خۆیدا لەشکری لەژێر بەیداغی ئوسامە ڕێکخست. بەڵام پێغەمبەر (د) لەوان ڕۆژاندا نەخۆش کەوت. لەشکر لەدەرەوەی مەدینە ... چاوەڕێی چاکبوونەوەی پێغەمبەر (د) نەڕۆیشت بەداخەوە لەم ناساغی‌یە لەداری دونیا باری کرد بۆ بەهەشتی بەرین. حەزرەتی ئەبوبەکر لەشکری ئوسامەی ڕەوان کرد بەڕاستی بەسەرکەوتنێکی زۆر لەتالان و کوشتاری زۆر لەکافران گەڕاوە.

٩٥٠: عَن عائِشَةَ اَنَّ هذه الاقوامَ بعضُها مِنْ بَعْضٍ.

## تەرجەمە

٩٥٠: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی گوتی قائفێک (واتا: پسپۆڕێک) هاتە لام پێغەمبەر (د) خۆی لەوێ بوو. ئوسامەی کوڕی زەیدو زەیدی کوڕی حارثەیش لەژێر لێفێک ڕاکشابوون. قاچیان دیاربوو پسپۆڕەکە گوتی ئەم قاچانە لەیەکترین. پێغەمبەر [illegible] ـەی عائشە ئەم پسپۆڕە دەڵێ ئەم قاچانە لەیەکترین واتە بەیەکتری دەچن.

(ش): واتا بەقسەی [illegible] زۆر دڵخۆش بوو چونکی ئوسامە لەڕەنگدا ڕەش بوو زەید سپی بوو. ئنجا هەندێ خەڵک دەیانگوت ئوسامە کوڕی زەید نی‌یە. زاندرا لەم حەدیثە عەمەل دەکرێ بەقیافەت لەکاتی اشتباه لای ئیمامی شافعی چونکی پێغەمبەر (د) زۆر پێ کەیف خۆش بوو. پێ خۆشبوونی پێغەمبەریش لەخۆڕا نی‌یە ئەبو حەنیفەو یارانی موخالفن -واتە پێچەوانەی ئەوان قسە دەکەن- لەبەر ئایەتی **(وَلا تَقْفُ ماليسَ لَكَ بِهِ عِلمٌ)** لەئیمامی مالیکیش وا دەگێڕنەوە لەبەندەو جاریە لەحوڕ -نا- واتا مرۆڤی ئازاد یەعنی لەحوڕ لەگەڵ حەنەفی موافقە.

٩٥١: عَن عـائِشَةَ (ض) اَنَّ بني اسرائيلَ كـانَ اِذا سَرَق فـيهِمْ الشريفُ تركوهُ. وإذا سَرَقَ فيهِمْ الضعيفُ قطعوهُ. لو كانت فاطِمَة لقَطَعْتُ يَدَها.

## تەرجەمە

٩٥١: دەگێـڕنەوە لەحـەزرەتی عـائشـە ڕەزای خـودای لێ بی گـوتی فـاطـمـەی کـچی ئەسوەدی مەخزومیە لەغەزای فەتحی خشلێکی دزی. یارانی پێغەمبەر لەبەینی خۆیان کەوتنە گفت و گۆ گوتیان کێ هەیە بەپێغەمبەر بلێ کە ئەم ژنەی بەجێ وڕێیە دزی کردووە دەستی نەبڕی. هیچ کـەسـێک لەخۆی ڕانەدیت. ئوسـامـەی کوڕی زەید قـسـەی لێ کـرد کـە دەسـتی نەبڕێ. پێغـەمـبەر (د) بەئوسـامەی فەرمـوو لەگەڵ ئوسـامەو حـازرانی مـەجلیس. بەڕاسـتی بەنی ئیسـرائـیل ئەگەر پیـاوێکی بەڕێ و جێ و بەنەسـەب دزی بکردبایە دەسـتیـان نەدەبڕی و زیان لێ دەهینا. وە ئەگەر پیـاوێکی زەعـیـفیش دزی بکـردبایە دەسـتیـان دەبڕی. منیش ئەگەر فاطمەی کچم بوایە دەستم دەبڕی.

(ش): ئەی ئوسـامـە تۆ لەسنووری شـەرع و خودایی حەق نی‌یە قـسـە بکەی بەگـوێرەی ئایەتی (السارقُ والسارقَةُ فاقطعوا أيديهما). فـەرقی شـەریف و زەعیف لەشـەرعی خودا نی‌یە ئەبێ دەستی ببڕێ. ئەمە گەورەیی‌یەکی زۆر بوو بۆ ئوسامە.

عَن أسامَةَ (ض) اللهُمَّ أحبّهما فأنّي أُحبّهما.

دەگێڕنەوە لەئوسـامـەی کوڕی زەید ڕەزای خودایان لێ بی گـوتی پێغـەمـبەر (د) من و حەسەنی لەباوەش دەگرت بەمنـاڵی دەی فـەرموو یاخودا تۆ ئەمـانەت خۆشـبوێ چونکی ئەم دوانەم خۆشدەوێ (ش): ئەمەش گەورەیی‌یەکی زۆر بوو بۆ حەسەن و ئوسامە.

٩٥٢: عَنْ حفْصَة (ض) اِنّ عبدالله رَجُلٌ صالحٌ.

## تەرجەمە

٩٥٢: دەگێـڕنەوە لەحەفصـەی دایکی ئیـمـانداران. گـوتی عـبداللە کوڕی عـومـەری برام خەونێکی دیتـبوو بۆ منی گێـڕاوە منیش خەونەکەم بۆ پێغـەمـبەر (د) گێـڕایەوە. فەرمـووی بەڕاسـتی عبداللە پیـاوێکی صـالحە (باشـە). لەگێـڕانەوەیەکی تریش فـەرمـووی عـبـداللە پیـاوێکی باشـە ئەگـەر شـەونوێژی بکردایە. لەپاش ئەم فـەرمـوودەیە تا تەمـەنی گـەیشـتە هەشـتـاو شەش سـاڵ شـەونوێژی واز لێ نەهینا ئەم حەدیشە بەدرێژی ڕدت بوو -في فَـضلِ من تعـار من اللَّيل- ئەم پەسندکردنە لەلایەن پێغەمبەر (د) بۆ عبداللەی کوڕی عومەر گەورەیی‌یەکی زۆرە.

**٩٥٣: عَنْ اَنَسٍ (ض) لِكُلِّ أُمَّةٍ اَمينٌ أَميننا ايتها الأُمَّةُ ابو عبيدَة ابنِ الجرّاحِ.**

### تەرجەمە

٩٥٣: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بۆهەر ئومەتێک ئەمینێک و خاوەن باوڕو متمانە پێ کراوێک هەیە. متمانە پێ کراوی ئێمەیش ئەی ئومەتی محمد ئەبو عوبەیدەی کوڕی عبداللەی جەراحە (ناوی عامر بوو- جەراحی باپیری لەغەزای ئوحود بەکافری کوژرا. گوتراوە کوڕی خۆی کە ناوی عبدالله بوو ئەو کوشتی. خۆشی ئەبو عوبەیدە لەساڵی هەژدەمی کۆچی لەشام وەفاتی کرد بەطاعون. چونکی لەلایەن حەزرەتی عومەر لەسەر شام داندرابوو بە (ئەمیر). ئەوەش گەورەییەکی زۆر بوو بۆ ئەبو عوبەیدە ڕەزای خوای لێ بی.

**٩٥٤: عَن البَراءِ (ض) اللهُمَّ اِنّي أُحِبُّهُ فأحِبَّهُ.**

### تەرجەمە

٩٥٤: دەگێڕنەوە لەبەرانی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بی گوتی دیتم حەسەنی کوڕی حەزرەتی عەلی لەسەر پیلی خۆی دانابوو (واتا لەبەینی شان و ملی) دەی فەرموو ئەی خودایا من ئەمەم خۆش دەوێ تۆیش خۆشت بوێ.

**٩٥٥: عَنْ ابْنِ عُمَرَ (ض) هُما رَيحانتايَ مِنَ الدُّنيا.**

### تەرجەمە

٩٥٥: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی پیاوێکی خەڵکی عیراق پرسیاری لێ کرد ئەگەر کەسێک لەئیحرامی حەج دابوو مێشێکی کوشت چی لازمەێ.

عبدالله گوتی خەڵکی عیراق پرسیار لەمێش دەکەن و کوڕی کچی پێغەمبەریش یان کوشت کە بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی حسن و حسین ڕەیحانی منن لەدونیا (من بێنیان دەکەم لەدونیا).

٩٥٦: عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ (ض) اللهُمَّ عَلِّمْهُ الحِكمَةَ وَفي رواية الكتابَ.

**تەرجەمە**

٩٥٦: دەگێڕنەوە لەعبدالله کوڕی حەزرەتی عەباس ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) منی بەسینگی خۆیەوە ڕاگوشی فەرمووی ئەی خودایا ئەمە فێری حیکمەت بکەی لەگێڕانەوەیەکی تر فەرمووی فێری مەعنایەکانی قورئان و ڕاستیەکانی بکەی.

٩٥٧: عَنْ اَنَسٍ (ض) اَخَذَ الرّايَةَ زَيْدٌ فأصيبَ ثمَّ اَخَذَ جعْفَرُ فأصيبَ ثُمَّ اَخَذَ ابْنُ رَواحَةَ فأُصيبَ. وَعَيْناهُ تذرفانِ حتّى اَخَذَ سَيْفٌ مِنْ سيوف اللّهِ حتّى فَتَحَ اللّهُ عليهِمْ.

**تەرجەمە**

(ئەم حەدیثە بەدرێژی لەباسی «جنائز» ڕەت بووە)

٩٥٧: دەگێڕنەوە لەئەنەس - گوتی پێغەمبەر (د) خەبەری شەهیدبوونی زەیدی کوڕی حارثەو جەعفەری کوڕی ئەبو طالب و عبدالله کوڕی ڕەواحەی بەخەڵکی گوت بێ جواب هاتن بەم تەرزە فەرمووی پێشان بەیداغ بەدەست زەیدەوە بوو شەهیدکرا پاشان کەوتەوە دەست جەعفەر ئەویش شەهید کرا. پاشان کەوتە دەست عبدالله ئەویش شەهید کرا. ئەنەس گوتی ئەم قسانەی دەفەرمووی چاوی پیرۆزیشی فرمێسکی هەڵدەڕشت (هەتا لەپاش شەهیدبوونی ئەم سێ سەرکردە دلێرە) شێرێک کە خالدی کوڕی وەلیدە لەشێرەکانی خودا بەیداغی هەڵگرت (بێ ئەمە کەمن فەرمانم پێ کردبێ) ڕوویدا لەگەڵ عەسکەری کافران (لەنیوەڕۆوە نوێشیری لەکەلاکی کافران پساند) بەسەرکەوتوویی و فەتح گەڕانەوە.

(ش): لای ابن حیان و حاکم بەگێڕانەوە لەنەبی نەوفی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی **(لا تُؤذوا خالداً فإنَّهُ سيْف مِن سيوف الله صَبَّهُ على الكُفّار)**. یەعنی خالد ئەزیەت و ئازار مەدەن چونکی خالد شمشێرێکە لەشمشێرانی خودا دای ڕژاندوتە سەر کافران.

٩٥٨: عَنْ ابنِ عُمرَ (ض) إستَقْرِءوا القرآنَ مِنْ اربَعَةٍ مِنْ عبداللّهِ ابْنِ مَسعودٍ وسالم مَولى ابي حُذيْفَةَ. وَاَبيه ابْنِ كَعْبٍ وَمعاذِ ابْنِ جَبَلٍ. قالَ لا أدري بَدَءَ بأبيَّ أو بمعاذٍ.

**تەرجەمە**

٩٥٨: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر- ڕەزای خودایان لێ بی پێغەمبەر (د)

فەرمووی داوای فێربوونی خوێندنی قورئان بکەن لەچوارکەس. یەکەم: لەعبداللەی کوڕی مەسعود وە لە سالم بەندەی ژنی ئەبو حوذەیفە (چونکی سالم بەندەی ژنەکەی بوو ئەبو حوذەیفە تەبەنی کردبوو یەعنی کردیە کوری خۆی ئنجا هەر نسبەت وەبال ئەبو حوذەیفە درا. ئەبو حوذەیفە نێوی موهەشەم بوو). لەئوبەی کوڕی کەعب و لەمەعاذی کوڕی جەبەل. ڕاوی ددلێ لەیادم نەماوە لەئوبەی و مەعاذ کامەیانی پێش خست.

(ش): تایبەت کردنی ئەم چوارە ئەگەرچی لەنێو ئەصحابی کرام (واتا یارەکانی بەرێزی پێغەمبەر) لەمانە گەورەترو زاناتر زۆر بوون بەتایبەتی هەر چوار یاری گەورە زیادیش لەوان عەلی ڕەزای خودای لەهەموویان بێ. لەبەر ئەمەبوو چونکی ئەم چوارە لەلێوی پیرۆزی پێغەمبەریان وەرگرتبوو. ئەوانی تر وادەبوو لەیەکتریان وەردەگرت ئەمانە بۆ تەواو بەجێ گەیاندنی لەفظی قورئان و خوێندنی بە چاکی بالاتر بوون. ئەگەرچی بەاعتباری علم بە مەعناو تێ گەیشتنی ڕاستی‌یەکان لەمانە بالاتر زۆر هەبوو.

# مناقب الأنصار
## وەصفی باشی ئەنصار

٩٥٩: عَنّ أَبي هُرَيْرَةَ (ض) لَوْ أَنَّ الأنصارَ سلكوا وادياً أو شِعباً لسلكْتُ في وادِ الأنصارِ وَلولا الهِجرَةُ لكُنْتُ امرءاً مِن الأنصارِ.

### تەرجەمە

٩٥٩: ددگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر ئەو یارانەی من کە خەڵکی مەدینەن لەشێوێک یا لەدۆلێک. بچنە ژورێ من بێ شک داخلی ئەم شێوە دەبم کە ئەنصار چووینە ئەوێ. وە ئەگەر کۆچ کردنی پیرۆز فەرمانێکی تاینی‌یەو خواپەرستی‌یەکی گەورەیە ئەبوایە من خۆم نسبەت وەباڵ خەڵکی مەدینە ددا بەڵام لەبەر ئەوەی لەمەککەوە کۆچم کردووە بۆ مەدینە نابێ. ئەوەیان گەورەیی‌یەکی زۆرە بۆ خەڵکی مەدینە.

٩٦٠: عَنِ البَراءِ (ض) الأنصارُ لايحّبهُمْ اِلاّ مؤمِنٌ ولايبغِضُهُمْ اِلاّ منافِقٌ فَمَنْ اَحَبَّهُمْ اَحَبَّهُ اَللّهُ وَمَنْ اَبغَضَهُمْ اَبْغَضَهُ اللّهُ.

### تەرجەمە

٩٦٠: دەگێڕنەوە لەبەرائی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی خەڵکی مەدینەی کە یارانی پێغەمبەرن. هیچ کەسێک ئەوانی خۆشناوێ خاوەنی باوەڕی نەبێ. کەسیش ڕقی لەوان نابێتەوە منافق و دوڕوو نەبێ. ئنجا هەرکەسێک ئەوانی خۆشبوێ خوداش ئەوکەسەی خۆش دەوێ. هەرکەسێکیش ڕقی لەوان ببیتەوە خوداش ڕقی ئەوکەسە دەبێتەوە.

٩٦١: عَنْ اَنَسٍ (ض) اللهُمَّ اَنتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ اِلَيَّ ثلاثَ مَرّاتٍ.

### تەرجەمە

٩٦١: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی کۆمەڵێکی زۆر ئەژن و منداڵ لەخەڵکی مەدینە لەسەر شیوی (بوک) دەهاتنەوە چاویان بە پێغەمبەر (د) کەوت پێغەمبەر (د) وەکوو چاوی بەوان کەوت بەتایبەتی بۆ خۆنیشاندان هەڵستا ڕاوەستا سێ جار فەرمووی خودا خۆی دەزانی. ئێوە ئەی خەڵکی مەدینە خۆشەویست ترینی خەڵکن لای من (ش): پێش خستنی (لەفظی) یا ووشەی (اللهم) بۆ پیرۆزی یاخۆ بۆ (استشهادە) بەخودا یەعنی خودا شاهیدە لەسەر ڕاستیم.

٩٦٢: عَنْ اَنسٍ (ض) وَالَّذي نَفسي بِيَدِهِ. اِنكُمْ اَحبُّ النَّاسِ اِليَّ ثلاثَ مَرّاتٍ.

### تەرجەمە

٩٦٢: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی ژنێکی مەدینەیی هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) کوڕێکی شیرخۆری پێ بوو سێ جار لەپاش گفت و گۆیەک فەرمووی سوێندم بەو زاتەی کە ڕووحی منی بەدەستە ئێوە خۆشەویست ترینی هەموو خەڵکێکن لای من. (ش): لەم حەدیثە پیرۆزە بۆ (تەبعیض) واتا جیاکردنەوەی هەندێک مِنْ (مقدەرە) بەقەرینەی دەلالەتی حەدیثی پێشوو چونکی لەوێ (مِنْ) هەیە. ئنجا پێچەوانە پەیدا نابێ لەگەڵ حەدیثی ڕابردوو کە فەرمووی ئەبو بکرم لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ وەکوو لێیان پرسی کێت لەهەموو کەس خۆشتر دەوێ.

٩٦٣: عَنْ زَيْدِ ابْنِ الأرقم (ض) اللهُمَّ اجْعَلْ اَتباعَهُمْ مِنْهُمْ.

**تەرجەمە**

٩٦٣: دەگێڕنەوە لەزەیدی کوڕی ئەرقەم ڕەزای خودای لێ بی گوتی خەڵکی مەدینە بەپێغەمبەریان گوت ئەی پێغەمبەری خودا. بۆ هەر پێغەمبەرێک کەسانێک هەبوونە شوێنی‌یان کەوتوون ئێمەش شوێن تۆ کەوتوین و لەگەڵ تۆ داین دوعا لەخودا بکە ئەوانی شوێن پێ‌ی ئێمە دەکەون هەر لەخۆمان بن. یەعنی پێ‌یان بگوترێ ئەنصار هەتا وەکوو ئێمە بگەینە گەورەیی و شەرەف.

(ش): لەم حەدیثە پیرۆزە تەماشا بکە کارکردنی هەوالیەتی و ڕەفاقەت لەهەموو شتێک هەیە. بزانە تەیرەکانی ڕاو. چەند بەنرخ و بەقیمەتن لەخۆشی دانە چونکی لەهەوالی‌یەتی پاشایانن: دار لەبەر ئەوەی لەگەڵ دارتاشدایە ڕزگاری دەبی لەسووتان. حەدیثی ڕاست (المرءُ مَعَ مَنْ اَحَبَّ) واتا مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێ ئنجا پێغەمبەر (د) دوعای بۆ ئەتباعی ئەوانیش کرد گوتی ئەی خودایە ئەتباعی ئەنصاریش هەر لەخۆیان بن) واتا هەروەکوو ئەوان خاوەن گەورەیی و شەرەف بن.

٩٦٤: عَنْ اَبي حُمَيْدٍ (ض). اِنَّ خيرَ دورِ الأنصارِ دارُ بني النجارِ. ثمَّ بني عَبدِ الأشهَلِ ثمَّ دارُ بني الحارثِ ثمَّ بني ساعِدَةَ وَفي كُلِّ دَوَرِ الأنصار خَيرٌ. فقالَ سَعَدٌ يارسولَ اللّه خيِّرَ دورُ الانصارِ فجُعِلْنا اَخراً. فقالَ اَوَ لَيْسَ بِحَسْبِكُمْ اَنْ تكونوا مِنَ الخيارِ.

**تێبینی**

ئەم حەدیثە لەباسی زەکات ڕەت بوو گفتوگۆی سعدی کوڕی عبادە ئەبێ لەگەڵ وەڵامی پێغەمبەر (د) کەوایە دووبارە نی‌یە زیادە هەیە.

**تەرجەمە**

٩٦٤: دەگێڕنەوە لەئەبی حومەیدی ساعدی ڕەزای خودای لێ بی ئەویش لەپێغەمبەر (د) گوتی فەرمووی باشترینی گەڕەکەکانی ئەنصار گەڕەکی بەنی نەجارن. لەپاشان گەڕەکی بەنی عبدالأشهلن لەپاشان گەرەکی بەنی حارثن. لەپاشان گەڕەکی بەنی ساعدن لەخەڵکی هەموو گەڕەکەکانی ئەنصار چاکە هەیە. هەندێ لەبەنی ساعدە بەسەعدی کوڕی عوبادەی ساعدیان گوت تەماشا ناکەی پێغەمبەر (د) یەکە یەکە گەڕەکەکانی ئەنصاری هەلبژارد ئێمەی خستەپاش هەموویان. سەعد ڕووبەڕوو بە پێغەمبەری گوت. هەموو گەڕەکەکانی ئەنصار بە هەلبژاردن باس کران. گەڕەکی ئێمە خرایە پاش هەموویان پێغەمبەر (د) لەوەلامی سەعد فەرمووی ئەرێ بەس نی‌یە بۆ ئێوە کە لەباشترینی هەموو گەڕەکان بن.

٩٦٥: عَنْ اَنَسٍ (ض) اِنكُمْ ستَلْقَوْنَ بَعْدي أُثْرَةً فاصبِروا حتّى تأتوني وَمَوعِدُكمْ الحَوْضُ.

## تەرجەمە

٩٦٥: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی. گوتی ئوسەیدی کوڕی حوضەیری ئەنصاری هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی هاتوومە تەعینم بکەی لەسەر شارێک یا لەسەر صەدەقات وەکوو عەمری کوڕی عاص پێغەمبەر (د) فەرمووی لەپاش من تووشی (أُثـــــرە) دەبن واتا تووشی ئەوە دەبن کە خەڵکی تر پەسند دەکەن لەسەر خۆتان بۆ دامەزرادنیان لەکاروباری میری. ئنجا خۆتان ڕاگرن هەتا ئێوە دێنە لام زەمانی بەیەک گەیشتنیشمان لەسەر حەوزی کەوثەر دەبێ.

(ش): لای هەندێکان حەوز لەپێش - پردی صراطە لای هەندێکانیش حەوزێک هەیە لەپێش صراط حەوزێکیش هەیە لەپاش صراط.

تێبینی دانەر: لەم حەدیثە وادەزاندرێ کە فەرمانبەرانی میری گەورە لەئەنصار هەڵناکەوێ.

٩٦٦: عَن اَبي هُرَيْرَةَ (ض) مَنْ يَضمُّ أو يُضيّفُ هذا فقالَ رَجُلٌ مِنَ الأنصارِ اَنا فانطَلَقَ بِهِ. فَلَمّا اَصبَحَ غَدا الى رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم. فقالَ ضَحِكَ اللّهُ اللَّيْلَةَ. أو عَجِبَ مِن فعالِكُما فأنزلَ اللّهُ (وَيُؤْثِرونَ عَلى اَنفُسِهِمْ وَلَو كانَ بِهِمْ خَصاصَةٌ وَمَنْ يوقَ شُحَّ نفْسِهِ فأولئكَ همُ المفلحونَ).

## تەرجەمە

٩٦٦: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پیاوێک هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) پێی گوت زۆرم برسی‌یە (ش: پیاوەکە ئەبو هورەیرە خۆی بووە) پێغەمبەریش ناردیە لای دایکی ئیمانداران خێزانە پاکەکانی خۆی بۆ خواردەمەنی‌یەک وەلامیانداوە ئاو نەبێ لەخواردەمەنی هیچمان لانی‌یە. پاشان پێغەمبەر (د) فەرمووی کێ ئەم پیاوە بەمێوانداری ئەباتە لای خۆی، پیاوێک لەئەنصار گوتی من مێوانداری دەکەم وە ئەیبەمە لای خۆم. مێوانەکەی بردە ماڵی خۆیان بەئافرەتەکەی خۆی گوت، ڕێزی مێوانی پێغەمبەر بگرە. ئافرەتەکەی گوتی هیچمان نی‌یە بەشی خواردنی منداڵەکانمان نەبێ. ئەنصاریەکە گوتی خواردنی خۆت دروست بکە چرایەکەت هەڵ بکە، منداڵەکانت بنوێنە

ئەگەر دەیانەوێ خواردن بخۆن. ئافرەتەکە خواردنی دروست کرد. چرای هەڵکرد. مندالەکانی بەبرسیەتی نواند. پاشان ئافرەتەکە هەڵستا. گۆیا چرایەکەی چاک دەکا. چرایەکەی کوژاندەوە. ئەنصاریەکە خۆی و ئافرەتەکەی وایان پیشاندا لەپێش میوانەکە کە ئەوانیش دەخۆن کەچی نەشیاندەخوارد ئەگەرچی پێویستیشیان بەخواردن هەبوو. ئەوشەوە بەبرسیەتی مانەوە. سبەینە ئەنصاریەکە هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی – واتا بەئەنصاریەکەی فەرموو. ئێمشەو لەوکاری باشی ئێوە کردتان خودای گەورە پێ کەنی. یاخۆ فەرمووی –پێی خۆشبوو. شک لەوەیە کە گێرایتیەوە. وە لەوەصفی ئێوەش ئەم ئایەتە هاتە خوارێ (وَيُؤْثِرونَ علی اَنفُسِهِمْ وَلَو كانَ بِهِمْ خَصاصَةٌ). یەعنی: غەیری خۆیان پێش دەخەن لەسەر خۆیان با لەزۆر برسیەتیش دابن.

(ش): لەحەدیث ووشەی (فعال) لە (فعالكما) هاتووە کە ناوە بۆ کاری باش واتا (اسم الفعله) مەصدەری (مفاعله) نی‌یە.

٩٦٧: عَنْ اَنَس (ض) أوصيكُمْ بالأنصار. فأنَّهُمْ كَرِشي. وَعَيْبتي. وَقَدْ قَضَوا الَّذي عَلَيْهِمْ وَبَقيَ الَّذي لَهُمْ. فأقبلوا مِنْ محسنِهِمْ وتجاوزوا عَنْ مُسيئِهِمْ.

### تەرجەمە

٩٦٧: دەگێرنەوە لەئەنەس رەزای خودای لێ بی گوتی حەزرەتی ئەبو بەکرو عەباس بەلای مەجلیسێکی ئەنصاردا رەت بوون لەناساغی وەفاتی پێغەمبەر (د) دیتیان خەڵکی مەجلیس دەگریێن. عەباس گوتی بۆچی دەگریێن گوتیان یادی مەجلسی پێغەمبەر دەکەین. زۆر دەترسین ئەم مەجلیسەمان لەدەست بچی و وەفات بکا عەباس و ئەبو بەکریش چوونە خدمەت پێغەمبەر (د) ئەم قسەیان بۆ گێرایەوە. ئەنەس گوتی پێغەمبەر (د) تەشریفی هەڵستا چووە دەرێ چووە سەر مینبەر لەبەر ناساغی سەری پیرۆزیشی توند پێچرابوو چووە سەر مینبەر دواجاریش بوو کە چووە سەر مینبەر لەپاشی سوپاس و ستایشی خودا فەرمانتان پێ دەکەم بەپاراستنی مافەکانی ئەنصار. چونکی ئەنصار جەماعەتی منن. وە جێگای سرو مەحرەمی رازی منن. هەرچی لەسەریان هەبوو ئەوان بەجێیان گەیاند (واتا لەشەوی عەقەبە هەر وەعدەیێکی بەمنیاندا لەیارمەتی و حەواندنەوەو باوەڕهینان و شتی تریش هەموویان جێ بەجێ کرد. جەزای چاکەکانی ئەوانیش کەچوونە ناو بەهەشتە من بەڵێنم پێداون ماوە. لەپیاوی باشیان چاکە قبول بکەن. لەپیاوەکانی خرابیشیان ببوورن.

(ش): لەو شتە نەبی کە شەرع دایناوە چونکی ئەو حەدەی شەرع دایناوە حقوقی شەرعە.

٩٦٨: عَنْ ابنِ عَبّاسٍ (ض) اَمّا بَعْدُ اَيُّها النّاسُ فأنَّ النّاسَ يكثرونَ وَتقلُّ الأنصارُ حتّى يكونوا كالمِلْحِ في الطَّعامِ فَمَنْ وَلِيَ منكُمْ اَمْراً يَضُرُّ فيهِ اَحَداً اَو يَنفَعُهُ فلْيَقبَلْ مِنْ محسنِهِمْ ويتجاوَزُ عَنْ مُسيئِهِمْ.

### تەرجەمە

٩٦٨: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عباس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) تەشریفی هاتە دەرێ لێفێکی لەسەر شانی بوو بەتێ وەرگیراوی. پەڕۆیەکی ڕەشی لەسەر پێچرابوو چووە سەر مینبەر سوپاس و ستایشی خودای کرد. پاشان فەرمووی. ئەی خەڵکینە بەبێ شک خەڵک زۆر دەبن وە ئەنصاریش کەم دەبن (چونکی سنعەتی یارمەتی دانی و حەواندنەوەی پێغەمبەری خودایان تێدایە وە ئەوانیش هەر کەم دەبن هەتا دواییان دێ). ئنجا لەبەر ئەمە ئەگەر یەکێک لەنێوە ئەی کۆمەڵی (موهاجیرەکان) فەرمانێکی میری کەوتە دەست کە لەفەرمانەکە بتوانێ زەرەر بەیەکێک بگەیەنی یا کەڵکێکی پێ بگەیەنی. باقبوول بکا چاکەی پیاوە باشەکانی ئەنصار وە بشبووری لەبەدی پیاوەکانی بەدکاریان (دانەر: لەمە وا دەزاندرێ کاربەدستانی حکومەت (میری) لەخەڵکی مەککە دەبن).

٩٦٩: عَنْ اَنَسٍ (ض) اِنَّ اللّهَ اَمَرَني اَنْ اَقرَاَ عَلَيْكَ لَمْ يكُنِ الّذينَ كفَروا. قالَ وَسَمّاني. قالَ نَعَمْ. فبَكى.

٩٦٩: دەگێڕنەوە لەئەنەس (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) ڕوو بەڕوو بە ئوبەی گوت (ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیسی کوڕی عوبەیدی کوڕی زەیدی کوڕی معاویە کوڕی عەمری کوڕی مالکی کوڕی نەجار کە ناوی تیم اللات بوو کوڕی تەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی خەزرەجی گەورەو عامری. واتا خەزرەج لە تیرەی عامری بووە. لەعەقەبەو بەدر حازربوو. هەرجارە حەزرەتی عومەر دەی فەرموو ئوبەی گەورەی موسولمانانە لەساڵی ٣٠ هیجری وەفاتی کرد). بەڕاستی خودای گەورە فەرمانی بەمن کرد بۆتۆ بەڕاگەیاندنێکی تایبەتی سوورەتی (لَمْ يكنِ الذينَ كَفَروا) بخوێنمەوە. ئوبەی گوتی ئەی پێغەمبەری خودا. خودای گەورە بەم هەموو گەورەیی‌یەی خۆی ناویشی هێنام پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڵێ. فەرمووی لەبەر کەیف خۆشی لەترسی نەتوانینی سوپاس کردن لەسەر ئەم چاکە گەورەیە گریا.

(ش): دەربارەی خوێندنەوەی ئەم سووردتە بۆ ئوبەی هەروەک قرطبی گوتیتی چونکی ئەم سوورەتە ئەگەرچی کورتە بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو باسەکانی خوا بەیەک زانینی و ناردنی پێغەمبەر بە پێغەمبەرایەتی و دڵسۆزی و باس کردنی ئەم سورەتە بۆ ئەم لاپەڕەو کتێبانەی ناردراو لەلایەن خودا بۆ سەر پێغەمبەرانی و باسی نوێژو زەکات و هەڵستانەوەی ڕۆژی قیامەت و باس کردنی ئەوانەی لەبەهەشتن و ئەوانەی لەئاگرن. کەلکێکی زۆری هەیە. گوتراویشە حیکمەتی تایبەتمەند (تخصیص) کردنی ئوبەی بۆ فێربوونی ووشەکانی قورئان و چۆنیەتی خوێندنی و جێگایانی ڕاوەستان لەکاتی خوێندنی قورئان. وە بۆ فێربوونی نەغاماتی (ئاوازی) قورئان کە شەرع بۆی قەرار داوە. چونکی بۆ هەر ئاوازێک لەمانە کارتێکردنێک هەیە لەنفوسی خەڵک چونکی ئوبەی کوڕی کەعب یەکێک بوو لەو چوار قورئان خوێنانەی کە پێغەمبەر (د) فەرمووی بۆخۆتان ... حوارانە فێری قورئان خوێندن بن لەمەپێش ڕەت بوو ئەم حەدیثەی دەربارەی ئەو کە ... قورئان خوێندن لەعبدالله کوڕی عومەر گێردراوەتەوە.

٩٧٠: عَنْ اَنَسٍ (ض) قالَ رسول اللّه صلى الله تعالى عليه وسلم لِمَنْ يُمَرّوا مَعَهُ الجُعْبَةُ مِنَ النَّبْلِ يَوْمَ اُحُدٍ (انْثرهُ ها) اَي لأبي طَلْحَةَ لانَّهُ كانَ رَجُلاً رامياً.

## تەرجەمە

٩٧٠: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەغەزای ئوحود بەئامادەبوونی پێغەمبەر (د) هەندێ خەڵک شکان. مەتاڵ بازی باش و تیرئەندازی بەتێنیش کە ئەبو طەلحەی کوڕی زەیدی کوڕی سەهلی کوڕی ئەسوەدی کوڕی حەرامی ئەنصاری خەزرەجی بوو بەخۆی و شیرو مەتاڵی ئەو مەتاڵەی لەچەرمی پوختە دروست کرابوو. وە بەتیرو ژێی کەلەسیرمەی دەباغ نەکراو دروست کرابوو. بۆ پارێزگاری گەورەترینی کائنات پێغەمبەر (د) وەکوو سوپەر. وە بەهێزێکی زۆر وەکوو کێو لەبەر پەرچ دانەوەی کافران بوو.

ئەبو طەلحە ڕەزای خودای لێ بی. چونکی تیراندازی باش بوو ئەو ڕۆژە دوو یا سێ ژێی کەوانی لەبەر توند ڕاکێشانی لەدەست پسا. هەرکەسی بەلای دا ڕەت بوویایە پێغەمبەر (د) فەرمانی پێ دەکرد (تیردانەکەت بۆ ئەبو طەلحە هەڵڕێژە). لەکاتی تیرهاویشتنی هەردوو لەشکر ئەگەر پێغەمبەر بۆ زانینی دەوروپشت خۆی بەدیار بخستایە ئەبو طەلحە بانگی دەکرد ئەی پێغەمبەری خودا. باوک و دایکم بەقوربانت بێ خۆت بەدیار مەخە نەوەک لە لایەن کافران تیرێکت پێ بکەوێ. سنگم لەپێش سنگتە ئەنەس گوتی

جوم بەحەزرەتی عائشەی کچی حەزرەتی ئەبو بەکر کەوت لەگەڵ ئومی سولەیمی خێزانی ئەبو طەلحە ئاویان بۆ ئەصحابەکانی بەڕێز دەکێشا هەتا بەرادەیەک وەکوو ئاویان بەتاڵ دەکرد. وا خۆیان هەڵکردبوو جێگای خلخالیان بەدیار دەکەوت ئیتر کارو پیشەیان هەر ئاو هێنان بوو.

(ش): ئەمە لەپێش هاتنەخوارەوەی ئایەتی حەرام کردنی تەماشاکردنی ژنان بوو.

**٩٧١: عَن عبدالله ابن سلام (ض) تِلْكَ الرَّوضَـةُ الاسلامُ وَذلِكَ العمودُ عمودُ الاسلامِ. وتِلْكَ العُرْوَةُ الوثقى. فأنتَ على الاسلامِ حتَّى تموتَ.**

## تەرجەمە

٩٧١: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی سەلامی کوڕی حارثی ئیسرائیلی یوسفی لەبەنی قەینەقاع بوو. لەپاشان بووە حەلیف و سوێند خۆری ئەنصار لەپێش ئیسلام ناوی (الحصين) بوو باشان پێغەمبەر ناوی نا (عبدالله) ڕەزای خودای لێ بێ کە لەساڵی چل و سێی کۆچی وەفاتی کرد. گوتی لەزەمانی پێغەمبەر (د) خەونێکم دیت بۆم گێڕایەوە. لەخەو دیتم لام وابوو لەنێو باغێکدام. باسی فرەوانی و سەبزی ئەم باغە ناکرێ بەتەواوی ئەگەرچی هەندێکیشی پێ گوت. کۆڵەگەیێکی لەئاسنیش لەناوەندی باغەکەبوو بنی لەعاردبوو. سەری لەئاسمان بوو. لەسەرەوەی قولپێک هەبوو. پێم گوترا سەرکەوە. گرتم پێم ناکرێ سەرکەوم خزمەتکارێک هات لەلای پشتەوەم شمەکی گرتم سەرکەوتم هەتا چووومە سەرەوە. قولپەکەم گرت. پێم گوترا توند بیگرە بەخەبەر هاتم. قولپەکەشم هەر لەدەستدابوو. ئنجا ئەم خەونەم بۆ پێغەمبەر (د) گێڕایەوە. فەرمووی ئەم باغە دینی ئیسلامە. ئەم کۆڵەگەیەش کۆڵەگەی ئیسلامە کە هەر پێنج پایەکانی‌یەتی. ئەم قولپەش عروە الوثقیٰ ی ئیسلامە کە ئیمان و باوەڕە. خودای گەورە فەرموویەتی (**فَمَنْ يَكفُرْ بالطّاغوت ويؤمِن باللّهِ فقد استمسَكَ بالعُروَةِ الوثقى**). وە تۆیش لەسەر ئیمان و باوەڕ دەوام دەکەی هەتا دەمری.

(ش) بۆیێ یارانی پێغەمبەر وەکوو چاویان بە عبدالله بکەوتبایە دەیانگوت ئەمە ئەهلی بەهەشتە واتە بەهەشتی‌یە. عبداللەش لەبەر تواضع (خۆ بەگەورە نەزانین) دەی گوت وامەڵێن چونکی لایق نی‌یە شتێ بگوترێ کە مسۆگەر نەبێ. واتا ئەم قسەی ئەصحابی پێ ناخۆش بوو.

**٩٧٢: عَنْ عائِشَةَ (ض) اِنَّها كانَت وكانت وكان لي منها وَلَدٌ.**

## تەرجەمە

٩٧٢: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی. ئەمەندەی دەرحەق بەحەزرەتی خەدیجە غیرەتم دەبزووت دەرحەق بەهیچ یەکێک لە ژنە پاکەکانی پێغەمبەر غیرەتم نەدەبزووت کەچی نەشم دیتبوو. بەڵام پێغەمبەر (د) زۆر باسی دەکرد زۆر جار مەڕێکی دەکوشتەوە بەدەستی پیرۆزی پارچە پارچەی دەکرد بۆ ئەو ئافرەتە بێوەژنانەی دەنارد کە دۆست و خۆشەویستی خەدیجە بوون بەتێری. منیش زۆرجار پێم دەگوت. کاشکی بێ لەخەدیجە هیچ ژن لەدونیا نەبوایە. پێغەمبەریش (د) لە بەدیارخستنی ئەوصافی باشی دەی فەرموو خەدیجە ژنێکی وابوو (واتا ژنێکی عاقل و بەڕێزو باش بوو بەم تەرزە درێژەی بەقسەکانی دەداو دەی فەرموو من منداڵم لەو هەیە کە لەهیچ ئافرەتەکانی تر منداڵم نەبوو ابراهیم نەبێ کە لەماریەی قبطی بوو.

**٩٧٣: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) قالَ اَتى جبريلُ النبيَّ صلى الله تعالى عليه وسلم فقال يارسول الله هذه خديجَةُ قَدْ اَتَتْ مَعَها إناءٌ فيهِ اِدامٌ. أو طعامٌ أو شرابٌ فاذا هِيَ اَتَتْكَ فاقرَأ عليها السَّلام مِن رَبِّها ومِنّي وَبَشّرها ببيتٍ في الجنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لاصَخَبٍ فيهِ وَلا نَصَب.**

## تەرجەمە

٩٧٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی حەزرەتی جبریل سەلامی خوای لێ بی لەغاری حەرا هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە خەدیجەیە بۆلای تۆ هات قاپێکیشی پێیە. ئنجا ئەوی گێڕایەوە دەلێ لەشکدامە یا گوتی پێخۆرێکی تیایە یا گوتی خواردنێکی تیایە یاخۆ گوتی خواردنەوەیەکی تیایە. ئنجا وەکوو هاتەلات سەلامی پێ بگەینە لەلایەن خودای خۆیەوە وە لەلایەن منیشەوە. وە مژدەشی پێبدە بەخانوێک لەبەهەشت لەقەمیشی لۆلۆی کلۆر وە ڕێک و ڕازایەوە بەدور و یاقوت کە لەو خانوەشدا هیچ دەنگە دەنگ و گاڵەگاڵ نی‌یە وە هیچ ماندووبوونیش نی‌یە بۆ چاک کردنی کون و کەلەنی. وەکوو خانوەکانی دونیا.

(ش): سوهەیلی گوتیتی حیکمەت لەنەبوونی ئەم دوو وەصفە لەخانووی خەدیجە نەبوونی ئەم دوو صفەتانە بوو لەخەدیجە وەکو دەعوەتی کرد بۆ باوەڕهینان وانەبوو

کێشەیەک دروست بکا. یان گالّەگالّێک بکا یان شتێکی وا بکا ماندووبوونێکی تێدابی. بەلّکی خەریکی لابردنی هەموو ماندوویوونێک بوو لەسەر پێغەمبەر (د) ناخۆشی لەسەر سووک دەکرد هێمنی دەکردەوە وەحشەتی لەسەر دلّی لادەبرد. لەپێش هەمووکەس باوەڕی پێ هێنا بەبێ قسەو دەنگە دەنگ. ئنجا موناسەبە پەیدابوو کە خودا خانوێکی پێدا لەگەلّ صفەتەکانی خۆی بگونجێ:

طەبەرانی زیادی کردووە لەسەر ئەم حەدیثە. حەزرەتی خەدیجە لەوەلامی سەلامی خوداو جبریل گوتی هو السلام و منه السلام وعلی جبریل السلام) واتا خۆی سەلامەتو سەلام ئەوە وە سەلام لەسەر جبریل بێ). نسائیش زیادی کردووە لەسەر حەدیثی ئەنەس. (وَعَلَيْكَ يارسول الله السلام ورحمة الله وبركاته). بزانە لەبەر ئەم تێ گەیشتن و عەقلە چلۆن وەلّامی سەلامی خودای داوەتەوە. بەتەرزێکی وا کە لەگەورەیی ئەو بودشێتەوە وەکوو وەلّام دانەوەی سەلامی عالەم نی‌یە. چونکی لەجیاتی وەلّام دانەوەی سەلام سوپاس و ستایشی کرد. دوعای نەکرد وەکوو سەلام کردنی ئێمە لەیەکتریان.

**٩٧٤: عَنْ عائِشَةَ (ض) قالَت استأذَنَتْ هالَةُ بِنتُ خوَيلدٍ اُختُ خديجَةَ على رسول الله صلى الله تعالى عَليهِ وَسَلَّم فَعَرفَ استئذانَ خديجَةَ فارْتاعَ لذلِكَ فقالَ اللهُمَّ هالَةُ.**

**تەرجەمە**

٩٧٤: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی گوتی هالە کچی خویلد کچی روبەیعی کوڕی عبدالعزی کوڕی عەبدی شەمس بوو. باوکی ابو العاص مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر (د). کە خوشکی خەدیجەی گەورەبوو ئیزنی خواستەوە کە بێتە خدمەت پێغەمبەر (د) لەمەدینە چونکی لەوانەبوو کە کۆچی کردبوو.

وە دەنگیشی زۆر بەدەنگی خەدیجە دەچوو لەبەر ئەوەی خوشک بوون. پێغەمبەر لەدەنگی ڕاجفلی فەرمووی ئەمە هالەیە عائشە گوتی غیرەتم کەوتە جوولە پێم گوت چی‌یە تۆ ئەمەندە باسی ئەم پیرەژنە قورەیشی‌یە دەکەی سپیاتی لەلغاوە نەمابوو سۆراتی نەبێ. لەپیریان مرد پێغەمبەر (د) بەدەرەجەییێکی - واتە بەڕادەیەکی وا ڕقی بۆوە هەتا گوتم بەحەقی ئەو زاتەی کە بەراست تۆی ناردووە بەپێغەمبەرایەتی. جارێکی تر باسی خەدیجە ناکەم بەمەدح و چاکە نەبێ.

٩٧٥: عَنْ ابنِ عُمرَ (ض) اَلا مَنْ كانَ حالِفاً فلا يحلِفُ اِلاّ باللّهِ.

### تەرجەمە

٩٧٥: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی. ئاگاداربن. هەرکەسێک بی‌یەوێ سوێند بخوا باسوێند بەناوی خودا یا بەصفەتی خودا بخوا (چونکی سوێند لەبۆ گەورەیی ئەوەیە سوێندی پێ دەخورێ. ڕاستی گەورەییش تایبەتە بەخودای گەورە).

٩٧٦: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) اَتاني وَفدُ جنّ نصيبينَ وَنِعْمَ الجِنُّ فسألوني الزّادَ فَدَعَوْتُ اللّهَ لَهُمْ اَنْ لايمرّوا بِعَظْمٍ وَلا رَوْثَةٍ اِلاّ وَجدوا عليها طعاماً.

### تەرجەمە

٩٧٦: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی هەر جارە دێمکە ئاوێکی بچووکی لەخدمەت پێغەمبەر (د) بوو بۆ دەست نوێژێک بۆ پێویستی‌یەک هەڵم دەگرت. جارێک تەشریفی هەڵستا. منیش کەوتمە شوێنی کاتێک فەرمووی ئەمە کێ‌یە. گوتم من ئەبو هورەیرەم فەرمووی (أئتِني اَحجاراً استنفِضُ بها وَلاتأتِني بِعَظمٍ ولا بِرَوثَةٍ) لەم حەدیثە ئەمەندە لە کتاب الطهارە- واتە باسی پاک و خاوێنی ڕەت بوو تەواوی حەدیثیش ئەمەیە کە لێرەیە بەم تەرزە فەرمووی بۆیی ئێسقان و تەرسم بۆ مەینە چونکی وەفدێک لەجنی نصیبین هاتە لام جنی باش بوون داوای خواردنیان لێ کردم منیش دوعام کرد لەخودا بۆیان کەڕەت نەبن بەلای هیچ ئێسقان و ڕیخێک ئیلا مەگەر خواردنێکی لەسەر ببینن.

(ش): وەفدی جن بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) زۆرجار وابووە. جارێک لەبطن النخلە کە قورئانی دەخوێند (فَلَمّا سمعوهُ قالوا انصِتوا). حەوت کەس بوون جارێک لە (حجون). جارێک لە (بقع الفرقد) کوڕی مەسعودی لەگەڵدابوو جارێک لەدەرەوەی مەدینە زوبەیری کوڕی عەوامی لەگەڵدابوو جارێک لەسەفەرێک بلال کوڕی حارثی لەخدمەت بوو.

٩٧٧: عن ابي هريْرة (ض) اَصدَقُ كلِمةٍ قالها الشاعر كلمة لبيدٍ: (الا كُلُّ شيْءٍ ماخَلا اللّهُ باطِلُ) وَكادَ أُمَيَّةُ ابنِ ابي الصلت اَنْ يُسلِمَ.

## تەرجەمە

٩٧٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ڕاست ترین قسەیەک کە شاعر گوتیتی قسەی لبیدە کە گوتی (اگاداربە بێجگە لەخودا هەرشتێک نی‌یەو هیچە) نزیک بوو ئومیەی کوڕی ابو الصلت موسولمان بی.

٩٧٨: عَنْ أُمِّ خالِدٍ بنتِ خالدٍ (ض) سَنَاهُ سَنَاهُ.

## تەرجەمە

٩٧٨: دەگێڕنەوە لەئەمەتەی دایکی خالدی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام کچی خالدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ڕەزای خودای لێ بی. گوتی لەحەبەشە هاتمە مەدینە منیش منالێ بووم پێغەمبەر (د) جلکێکی لەبەرکردم لەئاوریشم و ڕەنگاوڕەنگ پێ‌یان دەگوت (خمیصە) دەستی پیرۆزی لەڕەنگەکان دەخشاند دووجار فەرمووی سناه واتا: جوانە جوانە.

٩٧٩: عَنْ عَباسٍ هو في ضحضاحٍ مِنْ نارٍ ولَولا انا لكانَ في الدَّرْكِ الأسفَلِ مِنَ النَّارِ.

## تەرجەمە

٩٧٩: دەگێڕنەوە لەعباسی کوری عبدالمطلب ڕەزای خودای لێ بی. بەپێغەمبەری گوت گوتی ئەی پێغەمبەری خودا. عەزابێکت لەسەر ئەبو طالبی مامت هەڵگرت چونکی ئەو زۆرباش تۆی دەپاراست لەدەست دوژمنان لەبەر تۆ زۆر دەکەتە ئەحوالی ڕک لێ بوونەوە پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەبو طالب لەتەنکاییێکی ئاگردایە هەتا قاپی دێ (واتا هەتا گۆزینگی). وە ئەگەر من نەبوومایەو شەفاعەتم بۆ نەکردایە لەنشیوترینی چینەکانی ئاگردا دەبوو.

٩٨٠: عَن أَبي سَعيد (ض) لَعَلَّهُ تنفَعُهُ شفاعتي يَوْمَ القيامَةِ فيُجعَلُ في ضحضاحٍ مِنَ النارِ يبلُغُ كعبَيْهِ يَغلي مِنهُ دِماغُهُ.

### تەرجەمە

٩٨٠: دەگێرنەوە لەئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) وەکو باسی ئەبو طالبی مامی لەخدمەت کرا. فەرمووی ڕجاوایە شەفاعەتی من کەلکی بگرێ ڕۆژی قیامەت بخرێتە گۆمێک لەئاگر بگاتە هەردوو قاپی مێشکی سەری لەبەر دەکولێ.

(ش): سوهەیلی گوتیتی حیکمت لەتایبەت کردنی ئاگر بەقاچەکانی ابو طالب. چەقاندنی قاچەکانی لەسەر میلەتی عبدالمطلب بوو لەکاتی ڕوح کێشان. چونکی لەکاتی مردن گوتی من لەسەر دینی عبدالمطلب و باوکەکانی خۆمم -موسولمان نەبوو- لەبەر حرصییش لەسەر پارێزگاری پێغەمبەر (د) بەشەکانی تری لەشی پارێزراوبوو لەئاگر. ئنجا تەماشای حیکمەتی خودا بکە چلۆن جەزای لەسەر چۆنییەتی کاروکردەوە داناوە (كلٌ يَعملُ على شاكلتِهِ).

## حديث الأسراءِ والمِعراج

## (باسی شەوڕۆو میعراج)

٩٨١: عَنْ جابِرٍ (ض) لَماَ كَذّبني قُرَيشٌ قُمْتُ في الحِجْر فجلا اللّهُ لي بيت المقدسِ فَطَفِقْتُ أخبرهم عن أياتِهِ وَانا انظرُ اليْهِ.

### تەرجەمە

٩٨١: دەگێرنەوە لەجابر ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو قورەیش قسەکانی منیان بەڕاست نەزانی هەلّستام ڕاوەستام خودا بەیت المقدسی هێنا پێش چاوم منیش دەستم پێ کرد بەخەبەردانی لەحجری اسماعیل نیشانەکانی بیت المقدس بەقورەیش و تەماشای بەیتیشم دەکرد.

٩٨٢: عَنْ مالِكِ ابْنِ صعصعة (ض) بينمان انا في الحطيم وَرُبّما قالَ في الحِجْرِ مضطجعاً اذْ اَتاني اَتٍ. فشقٌ مابيْنَ هَذه الى هذهِ قالَ الرّاوي مِنْ ثغْرَةِ نحْرِهِ الى شَعْرَتِهِ.. فاستخرَجَ قلبي ثمّ أُتيتُ بطَسْتٍ مِن ذَهَبٍ مملوءَةٍ إيماناً فغُسِلَ قلبي ثمّ حُشّيَ ثُمّ أعيدَ ثم أُتيتُ بدابّةٍ دونَ البَغل وَفَوقَ الحِمار اَبيضَ يَضَعُ خَطْوَهُ عِنْدَ اَقصى طَرفِهِ فَحُمِلْتُ عَلَيْهِ فانطَلَقَ بي جبريلُ حتّى اَتى السّماءَ الدُّنيا فاستفتَحَ. فقيلَ مَنْ هذا

قالَ جبريلُ. قيلَ وَمَنْ مَعَكَ. قالَ محمدٌ. قيلَ وَقَدْ أُرسِلَ اليهِ قالَ نَعَمْ. قيلَ مَرحباً به فنِعْمَ المجئُ جاءَ فَفَتَحَ. فلَمّا خَلَصْتُ فاذا فيها آدمُ. فقال هذا ابوك آدمُ فسلِّمْ عَلَيْه فَسلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ السَّلامَ. ثمَّ قالَ مَرحباً بالأبْنِ الصّالح والنبيَّ الصّالِحِ ثمَّ صَعِدَ حتّى أتى السَّماءَ الثانيةَ فاستفتَحَ. قيلَ مَنْ هذا قالَ جبريلُ. قيلَ وَمَنْ مَعَكَ قالَ محمَّدٌ. قيلَ وَقَدْ أُرسِلَ اِلَيْهِ قالَ نَعَمْ. قيلَ مَرحباً بِهِ فنِعْمَ المجئُ جاءَ فَفَتَحَ فَلَمّا خَلَصْتُ اِذا يحى وَعيسى وَهما ابنا الخالةِ. قالَ هذا يحى وَعيسى فسلِّمْ عَلَيْهما فَسلَّمْتُ فَردّا ثمَّ قالا مَرحباً بالأخ الصّالح والنبيَّ الصّالح ثُمَّ صَعِدَ بي اِلى السَّماءِ الثالِثة فاستَفْتَحَ. قيلَ مَنْ هذا. قالَ جبريلُ قيلَ وَمَنْ مَعَكَ قَالَ محمَّدٌ. قيل وَقَدْ أُرسِلَ اِلَيْهِ. قالَ نَعَمْ. قيلَ مَرحباً بِهِ فنِعْمَ المجئُ وَجاءَ ففتَحَ فَلَمّا خَلَصْتُ اِذا يوسفُ. قالَ هذا يوسفُ فسلِّمْ عَلَيْهِ. فَسلَّمْتُ عَلَيْهِ. فَرَدَّ. ثمَّ قالَ مَرحباً بالأخ الصّالِحِ والنبيَّ الصالح ثمَّ صَعِدَ بي حتّى أتى السَّماءَ الرّابِعَةَ فاستَفتَحَ قيلَ مَنْ هذا قالَ جبريلُ. قيلَ وَمَنْ مَعَكَ قالَ محمدٌ. قيلَ وَقَدْ أُرسِلَ اِلَيْهِ قالَ نَعَمْ. قيلَ مَرحباً به فنِعْمَ المجئُ جاءَ فَفَتَحَ فلَمّا خَلِصْتُ اِذا إدريسُ قالَ هذا إدريسُ فَسلِّم عَلَيْهِ فَسلَّمتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ. ثمَّ قالَ مَرحباً بالاخ الصّالح وَالنبيَّ الصّالح. ثُمَّ صَعِدَ بي حتّي أتى السَّماءَ الخامِسةَ. فاستَفتَحَ قيلَ مَنَ هذا قالَ جبريلُ قيلَ وَمَنْ مَعَكَ. قالَ محمدٌ صلى الله تعالى عَلَيه وسلم قيلَ وَقَدْ أُرسِلَ اِلَيْهِ قالَ نَعَمْ قيلَ مَرحباً بِهِ فنِعْمَ المجئُ جاءَ فاذا خْلِصتُ فاذا هارونُ. قالَ هذا هارونُ فسلِّم عليهِ فسلَّمتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ. ثمَّ قالَ مَرحباً بالأخ الصّالح والنبيَّ الصّالح ثمَّ صَعِدَ بي حتّى أتى السادِسَةَ فاستَفتَحَ قيلَ مَنْ هذا. قالَ جبريلُ قيلَ وَمَنْ مَعَكَ. قالَ محمدٌ قيلَ وَقَدْ أُرسِلَ اليْهِ قالَ نَعَمْ. قالَ مَرحباً بِهِ فنِعْمَ المجئُ جاءَ فَلَمّا خلصتُ فاذا موسى. قالَ هذا موسى فسلِّم عَلَيْهِ فَسلَّمتُ فَرَدَّ. ثمَّ قالَ مَرحباً بالاخ الصالح والنَبيَّ الصالح فَلَمّا تجاوزتُ بكى. قيلَ وَما يبكيكَ. قالَ أبكي لأنَّ غلاما بُعِثَ بَعْدي يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِهِ اكثرُ مِمَّن يَدْخُلها مِنْ أمتي. ثُمَّ صَعِدَ بي الى السَّماءِ السابِعَةِ. فاستَفتح جبريلُ. قيلَ مَنْ هذا قالَ جبريلُ. قيلَ وَمَنْ مَعَكَ قالَ محمدٌ. قيلَ وَقدْ بُعِثَ اليهِ. قالَ نَعَمْ. قالَ مَرحباً بِهِ فنِعمَ المجئُ جاءَ فلما خَلَصْتُ فاذا ابراهيم. قالَ هذا ابوكَ ابراهيمُ فسلِّم عَلَيْهِ فَسلَّمْتُ فَرَدَّ السَّلامَ. فقالَ مرحباً بالأبْنِ الصّالح والنبيَّ الصّالح. ثمَّ رُفِعْتُ الى سِدرَةِ المنتهى فاذا شقها مِثْل قِلالِ هَجرْ. وإذا وَرَقُها مِثْلَ آذانِ الفيلَةِ. قالَ هذه سدْرة المنتهى. اذا اربعةُ انهارِ نهرانِ باطِنانِ ونهرانِ ظاهرانِ. فقُلْتُ ماهذانِ يا جبريلُ. قالَ أمّا الباطِنانِ فنهرانِ في الجنَّةِ وَأمّا الظاهِرانِ فالنيلُ والفراتُ. ثُمَّ رُفِعَ لي البيتُ المعمورُ فاذا هو يَدْخُلُهُ كُلَّ يَوْمٍ سبعونَ

الفَ مَلَكٍ. ثمُّ أُتيتُ باناءٍ مِنْ صخْرٍ واناءٍ مِنْ لَبَنٍ واناءٍ مِنْ عَسَلٍ فأخَذْتُ اللَّبَنَ. فقالَ هِيَ الفِطرَةُ التي اَنتَ عليها وَأُمَّتُكَ ثمَّ فُرِضَتْ عليَّ الصلَّواتُ خمسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ فمررتُ على موسى فقالَ بمَ أُمِرْتَ. قُلْتُ أُمِرْتُ خمسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ. قالَ اِنَّ أُمَّتَكَ لاتستطيعُ خمسِينَ صَلاةً كُلَّ يَوْمٍ. وانِّي وَاللهِ قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبلْكَ وَعالَجْتُ بني إسرائيلَ اَشَدَّ المعالَجَةِ فارجعْ الى رَبِّكَ فاسئَلْهُ التخفيفَ لأمَّتِكَ. فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عنّي عَشراً فَرَجَعْتُ الى موسى فقالَ مِثْلَهُ. فَرَجَعْتُ فوضَعَ عنّي عَشراً فَرَجَعْتُ الى موسى فقالَ مِثلهُ. فَرَجعْتُ فوضَعَ عنّي عشراً. فَرَجَعْتُ الى موسى فقالَ مِثْلَهُ فرجعْتُ فوَضَعَ عنّي عشْرَ. فأمِرْتُ بِعَشْرِ صلَوات كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ. فقالَ مِثْلَهُ فرجَعْتُ. فأمِرْت بخمسِ صلَواتٍ كُلَّ يَوْمٍ فرجَعْتُ الى موسى. فَقالَ بِمَ أُمِرتَ قُلْتُ أُمِرْتُ بِخَمْس صلَواتٍ كلَّ يَوْمٍ. قالَ اَنْ اُمَّتَكَ لاتستطيعُ خمسَ صلَواتَ كلَّ يَوْمٍ. وَانِّي قدْ جَرَّبْتُ الناسَ قبلَكَ وَعالَجْتُ بني ارسائيلَ اَشَدَّ المعالَجَةِ فارجع الى رَبِّكَ فاسئَلْهُ التخفيفَ لأمَّتِكَ قالَ سَئَلْتُ رَبِّي حتّى استحيَيْتُ. ولَكِن اَرضى وأُسَلِّمَ. قالَ فلَمّا جاوَزْتُ ناداني مُنادٍ أمضَيْتُ فَرِيضتي وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبادي.

**تەرجەمە**

٩٨٢: دەگێڕنەوە لەمالکی کوری صەعصەعەی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی. ئەم حەدیثەی ئەسرا لای جمهور ئەسراو میعراج لەیەک شەو ڕووی دا. بەروح و جەستە ڕۆیشتووە لای بەشی زۆری زانایان لەمانگی ربیع الاول بەیەک ساڵ لەپێش هیجرەت بووە گوتراویشە لەڕەجەب بووە. لای ئەبو شەیبە لەحەدیثی جابرو کوری عەباس گوتوویانە پێغەمبەر (د) لەڕۆژی دووشەم لەدایک بووە. وەلەدووشەم کرایە پێغەمبەر (د) وە لەڕۆژی دووشەم برایە میعراج وە لەڕۆژی دووشەمیش کۆچی دوایی کرد. ئنجا مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) حیکایەتی شەوی ئەسراو میعراجی بۆ ئەصحاب گێڕایەوە. فەرمووی کاتێک لەحیجری اسماعیل پاڵ کەوتبووم لەناکاو یەکێک هات لەقۆرتی هەوکمەوە تا مونتەهای دڵی هینامە دەرێ زگمی شەق کرد. پاشان تەشتێکی زێری پر لە ئیمان هێنرا دڵم شۆرا پاشان پڕکرا لەئیمان. پاشان دڵم لەجێگای خۆی داندرایەوە.

(ش): شەق کرانی سینەی پیرۆزی پێغەمبەر (د) چوارجار ڕووی دا. جارێک لای حەلیمە بۆ دەرهینانی ئەختێ خوێنی پەیت کە پێی گوترا ئەمە بەشی شەیتانە لەتۆ فرێ درا. دووەم لەتەمەنی بیست ساڵیدا هەروەکوو شێخ ابن الحجری هیثمی وە شێخ عەلی أمهوری گوتویانە لەحیکایەتی ئیسرا. سێیەم لەغاری حەڕا وەکوو جبریل وەحی بۆ هێنا.

بۆوەرگرتنی وەحی بەدڵێکی پاکو بەهێز لەسەر تەواوترینی ئەحوال لەتەقدیس چوارەم شەوی میعراج.

(واتای حەدیث): پاشان حەیوانێکم بۆ هێنرا لە هێستر بچووکتر وە لەگوێ درێژ بەرزترو ڕەنگ سپی دایدەنا شەقاوی خۆی لەو جێگایە کە مونتەهای دیتنی خۆیەتی.

(ش): بەمە دەزاندرێ کە لەسەر عارد ڕۆیشتووە (گوتراوە ئەمە بوراقە). ئنجا لەو حەیوانە سوار کرام بەمنەوە ڕۆیشت جبریل هەتا ئاسمانی دونیا. لێرە حەذف هەیە- واتا شتێک هەیە کە نەنووسراوە. بەیهەقی تەصریحی پێ کردووە. لەحەدیث ئەبو سەعید بەم تەرزە گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو حەیوانەکەی بۆ هێنام کە مەرکەبی پێغەمبەرانی پێشووەو ناوی بوراقە من سواربووم لەگەڵ جبریل چوومە ناو (بيت المقدس) زۆر پێ نەچوو عالەمێکی زۆر لەپێغەمبەران لەوێ کۆبوونەوە. پاشان بانگدرا وە قامەتیشکرا جبریل پێی گوتم پێش کەوە. یەعنی لەپاش ئەوەی هەر پێغەمبەرێک دەی ویست خۆی پێش کەوێ جبریل منی پێش خست. پاشان پەیژەیەکی زۆر جوان داندرا هەر پێ بلکەیەکی لەزێڕ یەکی لەزیو بوو لۆلۆیان تێ گیرابوو لەهەر دوولایی ڕاست و چەپی فریشتە ڕاوەستابوون لەهەوەسی جوانی ئەم پەیژەیە مردوو لەکاتی روح کێشان هەردوو چاوی ڕادەگری. ئنجا بەمنەوە جبریل ڕۆیشت هەتا ئاسمانی دونیا بە لەدەرگادان داوای کردنەوەی دەرگای کرد نەک بەقسە. پێی گوترا کێیە ئەمە گوتی جبریلە. گوترا کێت لەگەڵدایە. گوتی محمد. گوترا لەدوای ناردراوە. گوتی بەڵێ. گوترا مەرحەبای لێ بی بەخێربێ چەند باشە ئەم هاتنەی کە پێ هاتووە. دەرگە کرایەوە. وەکوو گەیشتە ئاسمانی دونیا دیتی حەزرەتی ئادەم لەوێ بوو. جبریل گوتی ئەمە ئادەمی باوکتە سەلامی لێ بکە. منیش سەلامم لێ کرد. وەڵامی سەلامی دامەوە وە گوتیشی مەرحەبا لەو کوڕەی صالح و باش لەو پێغەمبەرەی صالح. پاشان جبریل بە منەوە هەوراز چوو هەتا ئاسمانی دووەم. جبریل لەدەرگەی دا کە دەرگەی لێ بکەنەوە. گوترا ئەمە کێیە. گوتی جبریلم. گوترا کێت لەگەڵدایە گوتم محمد. گوترا فەرمان ناردراوە کەبێ: گوتم بەڵێ. گوترا مەرحەبای لێ بی بەخێربێ چەند باشە ئەم هاتنە کەپێ هاتووە. دەرگە کرایەوە. وەکوو گەیشتم بەئاسمانی دووەم. دیتم عیسی و یەحیا لەوێ بوون. هەردوویان پلک زای یەکترین. بەم تەرزە حەنەو ایشاع خوشکبوون کچی ناقوذ بوون. ئنجا زەکەریا ئیشاعی هێنا یەحیای لێ بوو عمرانیش حەنەی هێنا مەریەمی لێ بوو. بەم اعتبارە پلکزابوون. ئنجا جبریل گوتی ئەمانە یەحیاو عیسان سەلامی یان لێ بکە. ئنجا سەلامم لێ یان کرد وەڵامی سەلامیان داوە. پاشان گوتیان مەرحەبا لەم برایە باشەو لەو پێغەمبەرە باشە. پاشان جبریل بەمنەوە

سەرکەوت بۆ ئاسمانی سێیەم. جبریل لەدەرگەی دا گوترا کێیە. گوتی جبریلە. گوترا کێت لەگەڵدایە گوتی محمد. گوترا ناردراوەتە شوێنی. گوتی بەڵێ. گوترا مەرحەبای لێ بی. بەڕاستی باشە ئەم هاتنەی کە پێ هاتووە. دەرگە کرایەوە. وەکوو لەدەرگە نەجاتم بوو دیتم یوسف لەوێ بوو. جبریل گوتی ئەمە یوسف پێغەمبەرە سەلامی لێ بکە. سەلامم لێ کرد. وەلامی سەلامی دامەوە گوتی مەرحەبا لەم برا باشەو پێغەمبەرە باشە. پاشان بەمنەوە هەوراز چوو هەتا ئاسمانی چوارەم. لەدەرگەی دا گوترا کێیە گوتی جبریلە. گوترا کێت لەگەڵدایە گوتی محمد. گوترا لەدوای ناردراوە. گوتی بەڵێ گوترا مەرحەبای لێ بی باشە ئەو هاتنەی کە پێ هاتووە ئنجا دەرگە کرایەوە وەکوو نەجاتم لەدەرگە بوو دیتم ادریس لەوێ بوو جبریل گوتی ئەمە ادریسە سەلامی لێ بکە سەلامم لێ کرد وەلامی سەلامی دایەوە گوتی مەرحەبا لەم برایە باشەو پێغەمبەرە باشە. پاشان بەمنەوە هەوراز چوو تا ئاسمانی شەشەم. لەدەرگەی دا. گوترا کێیە: گوتی جبریلە گوترا کێت لەگەڵە گوتی محمد. گوترا لەدوای ناردراوە. گوتی بەڵێ. گوتی مەرحەبای لێ بی باشە ئەم هاتنەی کە هات وەکوو لەدەرگە خەلاس بووم دیتم موسی لەوێ بوو گوتی ئەمە موسی یە سەلامی لێ بکە. سەلامم لێ کرد لەپاش وەلامم گوتی مەرحەبا لەم برا باشەو پێغەمبەرە باشە. وەکوو لەو جودا بوومەوە گریا پێی گوترا بۆ دەگریی گوتی بۆیێ دەگریم منالێک لەپاش من کرا پێغەمبەر ئەوانەی دەچنە بەهەشت لەئەتباعی ئەو زیاترن لەئەتباعی من.

(ش): حاشا ئەم گریانەی موسی لەبەر حەسوودی نەبوو لەبەر کەمی ئەجرو پاداشتی خۆی بوو. چونکی هەر پێغەمبەرێک هەندە پاداشتی ئەتباعی خۆی پاداشتی هەیە.

پاشان بەمنەوە بۆ سەرەوە رۆیشت هەتا ئاسمانی هەفتەم لەدەرگەی دا. گوترا کێیە گوتی جبریلە. گوترا کێت لەگەڵە. گوتی محمد گوترا بەتایبەتی ناردراوە بێ؟ گوتی بەڵێ. گوترا مەرحەبای لێ بی باشە ئەم هاتنەی کەهات. وەکوو لەدەروازەی حەوتەمیش خەلاص بووم. دیتم ابراهیم لەوێ بوو. گوتی ئەمە ابراهیمی باوکتە سەلامی لێ بکە. سەلامم لێ کرد. لەپاش وەلام دانەوەی سەلامم گوتی مەرحەبا لەم کوڕە باشەو لەم پێغەمبەرە باشە.

پاشان (سدرة المنتهی) کە سنوورێکە لەبەینی عالەمی هەوراز و نشێو. بەم تەرزەی لەعالەمی سەرەوەی پێ دەکرێ لەوێ زیاتر بڕوا بۆ خوارەوەی. نە عالەمی خوارەوەی پێ دەکرێ بۆ سەرەوەی بڕوا. بۆمن بەدیار خرا زۆرباش لەناکاو دیتم داری مۆزی ئەوێ مۆزی وای پێوەبوو لە تەڕو بڕی و گەورەیی وەکوو جەڕەگەورەکانی کە لەشاری هجر دروستی دەکەن بۆ ئاو وابوون. پەڵکی دارەکانی مۆزیش وەکوو گوێچکی فیل وابوون جبریل پێی گوتم ئەمە سدرة المنتهایە وەکوو دیتم چوار رووبار لەبن سدرة المنتها دەردەچوون. دوو

ڕووبار ئاشکرابوون دیاربوون دوپشیان ئاشکرا نەبوون لەباطن بوون. لەبن سدرة المنتها دەردەچوون بە جەبرەئیلم گوت ئەم چوار ڕووبارانە چین. گوتی ئەم دوانەی باطن دوو ڕووبارن لەبەهەشت. وە ئەم دوانەی دیاریش نیلی مصرو ئاوی فوراتە کە شاری کەربەلا بەواسطەی جۆگەی حوسەینیە ئاوی ئەویٚ دەخواتەوە. (طەیبی گۆتیتی واجبە دەرحەق بە نیل و فورات اعتماد بەظاهری حەدیث کە سەرچاوەیان سدرە المنتهایە پاشان بەویستی خودا بۆ ئەو جیٚگایانە دەچن کە خودا خۆی دەزانی پاشان دەردەچن لەعارد دەڕۆن لەو جیٚگایانەی مورادی خالقی خۆیتیان). پاشان بەیت المعموریشم باش بۆ دیاری کرا. وەکوو دیتم هەموو ڕۆژێک هەفتا هەزار مەلائکە دەچوونە نێو (بیت المعمور) دەریش نەدەچوون پاشان قاپێک لەشیر قاپێک لەشەراب قاپێک لەهەنگوین یان بۆ هێنام. منیش شیرەکەم وەرگرت جبریل گوتی ئەم شیرە ڕەوشت و ئەخلاقی ئیسلامیە کەتۆ بەئومەتی خۆتەوە لەسەر ئەم ڕەووشت و ڕاهاتنەن ئافەرین باش بوو ئەمەت وەرگرت. پاشان پەنجا نوێژم لەسەر فەرزکرا هەموو ڕۆژێک پاشان گەڕامەوە بەلای موسی ڕەت بووم گوتی بەچیت فەرمان پێ کرا گوتم بە پەنجا نوێژ فەرمانم پێ کرا هەموو ڕۆژێک گوتی بەڕاستی ئومەتی تۆ ناتوانی پەنجا نوێژ بکا هەموو ڕۆژێک. چونکی والله من خەڵکم تەجرەبە کردوونە لەپێش تۆ. زۆر هەوڵم لەگەڵ بەنی ئیسرائیل دا هیچ فائدەی نەدا واتا کەڵکی نەبوو. ئنجا بگەڕێوە بۆلای خودای خۆت داوای سووک کردنی لێ بکە بۆ ئومەتی خۆت منیش گەڕامەوە دەنوێژی لەسەر فڕەدام. گەڕامەوە لای موسی گوتم دەنوێژی لەسەر لابردم موسی گوتی بگەڕێوە پێیان ناکرێ گەڕامەوە دەی تریشی فڕەدا. گەڕامەوە لای موسی گوتی بگەڕێوە تاقەتی ئەمەندەیان نی‌یە گەڕامەوە دەی تریشی فڕەدا. گەڕامەوە لای موسی گوتی بگەڕێوە گەڕامەوە دەی تریشی لابرد. گەڕامەوە لای موسی گوتم دەنوێژی تریشی فڕەدا. فەرمانی پێ کردم دەنوێژ بکەم هەموو ڕۆژێ موسی گوتی بگەڕێوە ئەمەندەشیان پێ ناکرێ گەڕامەوە. فەرمانم پێ کرا بە پێنج نوێژ هەموو ڕۆژێک هاتمەوە لای موسی گوتی بگەڕێوە. بەبێ شک و گومان ئومەتی تۆ ئەم پێنجەشیان پێ ناکرێ. من لەپێش تۆ خەڵکم تەجرەبە کردوونە. زۆر خۆم بەبەنی ئیسرائیلەوە ماندووکرد سوودی نەبوو. گوتم لەپرسیارو داواکردن ئەمەندە درێژەم پێدا شەرم دەکەم بگەڕێمەوە جارێکی تر بەڵکی ڕازی دەبم. ئیتر بەدوعا سەلامت لێ دەکەم پاشان وەکوو لەموسی جودابوومەوە یەکێک بانگی کردم گوتی فەرزی خۆم ئیمزا کرد وە سووکیشم کرد لەبەندەکانی خۆم.

(ش): حەدیثی میعراج کە لەئەنەسی دەگێڕنەوە ڕەت بوو لەسەرەتای کتابی (الصلاه) تەرزێکی ترە لەگەڵ ئێرە.

٩٨٣: عَنْ عـائشَـةَ (ض) أرتُيكِ فـيِ المنامِ مَرَّتَينِ أرى أَنَّكِ فـي سرقَـةٍ مِنْ حـريرٍ ويُقـالُ هذه إمرأتُكَ فاكشفْ عنها. فاذا هِيَ انتِ. فأقولُ إنْ يَكُ هذا مِنْ عِندِ اللّهِ يُمْضِهِ.

### تەرجەمە

٩٨٣: دەگێـڕنەوە لەحـەزرەتی عـائشـە ڕەزای خـودای لێ بی گـوتی پێـغـەمـبەر (د) فەرمـووی ڕوو بەڕوو بەمنی گـوت صـورەتی تۆم دووجار لەخەو نیشـاندراوە. لەپارچەیەک لەئارمـووش و گـوتراویشـە ئەمە خێزانی تۆیە لەسەری لابدە تەماشـا بکە. مـنیش تەمـاشـا کردووە ئێسـتا وەکوو دەبینم ئەم صـورەتە تۆ بووی. ئنجا دەمگوت ئەگەر ئەم خەونەی من لەلایەن خودابێ خودا بەجێی دەگەیەنێ.

(ش): ئەگـەر بگوترێ خـەونی پێغـەمبەران هەمـووی بەبێ شـک لەلایەن خـودایە. ئەو شـەرتەش لەم حەدیثـە پیـرۆزە دەلالەت لەسـەر شـک و دوودڵی دەکـات. دەڵێین ئەم جـوملە شرطیەیە صـوغرای قیاسێکی اسـتثنائی‌یە کوبرای مطویە کە اثباتی مقدەمە بۆ ثبوتی تالی کـە امضـایە. تەواوی قیـاس وایە. (إن يَكُ هذا من عنداللە يُمـضِـهِ. لکنه من عنداللە. فيمضِهِ) ئنجا لەبەر ازدیادی تەحەقوقی نەتیجە کە امضایە تەرکی کبری کراوە. مەثەلەن وەکوو کەسـێک لەنیـوە ڕۆ بلێ (إن کانت الشـمس طالِعَةٌ) بۆ اثبـاتی وجودی ڕۆژ (نهار) دیارە پێغـەمبەر (د) هیچ شکی نەبووە کە خەونەکەی لەلایەن خوداوە بووە هیچ شکیشی نەبووە کە جێ بەجێشی دەکا.

ئەم جـوابە بەڕاسـتی قـبـوولی احـتـمـال ناکـا لەشـەرع. بەڵام وەلامـەکـانی زانایان لەشەرحەکان نووسـراوەتەوە هەمـووی لەسـەر نەسـاسی احتمال بناکراوە. بە احـتماليش يەقين حاصـل نابێ.

## باب الهِجْرَةِ والمهاجرين
## (باسی کۆچ کردن و کۆچکەران)

٩٨٤: عَنْ عـائِشَـةَ (ض) إنّي أُريتُ دارَ هِجـرتِكُمْ ذاتَ نَخْلٍ بيْنَ لابتَـيْنِ وَهُمـا الحرّتان. علـى رسْلِكَ فأني أرجو أنْ يُؤْذَنَ لي. فقال ابوبكرٍ وَهَلْ تَرجو ذلِكَ بأبي أَنتَ وَأُمّي قـالَ نَعَمْ. أخرج مِنْ عِندِكَ. فقـال ابوبكرٍ انّمـا هُمْ أهلُكَ بأَبي أنتَ يارسـول اللّه. قالَ فأنّي قَدْ أُذِنَ لي في الخروج فقالَ ابو بكرٍ الصَّحابَةَ بابي انتَ يارسول اللّه. قالَ نعَمْ. قـالَ ابوبكرٍ فَخُذْ بأبي انتَ يارسـول اللّهِ إحدى راحِلَتيَّ هاتَيْن قـالَ رسـول اللّه

صلى الله تعالى عليه وسلم بالثُّمَن وقالَ لِسُراقَةَ أَخْفِ عَنّا فقالَ رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم حينَ بَرَكَت بِهِ راحِلَتُهُ هذا اِنشاء اللّهُ المَنْزِلُ ثمّ بَناهُ مسجداً وَطفِقَ رَسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ينقُلُ مَعَهُمْ اللَّبِنَ في بُنيانِهِ ويقولُ هذا الحمالُ لاحِمالُ خيْبرَ. هذا اَبَرُّ رَبَّنا وَاَطهَرْ. ويقولُ. اللهُمَّ اِنَّ الأجْرَ اَجرُ الآخِرة. فارحِمِ الانصارَ والمهاجرَة.

### تەرجەمە

٩٨٤: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەمەککە ڕووبەڕوو بە ئەصحابە بەڕێزەکانی خۆی گوت بەڕاستی من نیشانم دراوە ئەو جێگایەی کە ئێوە بۆ ئەوێ دەچن. جێگایەکی بەدارخورمایە کەوتووتە بەینی دوو پارچە عاردی چەقێن. بەردەکانی ڕەشە ئنجا لەبەر تایبەتمەندی ئەو صفەتانەی کەلەفەرموودەی پێغەمبەر (د) هاتووە بەشاری مەدینە. یارو هاورێکانی پێغەمبەر (د) دەستییان کرد بەکۆچ کردن بۆلای مەدینە. وە ئەوانەی کە بۆ حەبەشەیش کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە گەڕانەوە بەتەواوی. جەعفەرو هاورێکانی نەبێ لەحەبەشە مابوونەوە. ئەبو بەکریش خۆی ئامادەکرد کە بۆ مەدینە کۆچ بکات پێغەمبەر (د) فەرمووی پەلە مەکە من ڕجام وایە ئیزن بدرێم بۆ کۆچ کردن ئەبو بەکر گوتی ئایا تۆش ڕجادەکەی کۆچ بکەی؟ باوکم و دایکم بەقوربانت بێ: فەرمووی بەلێ منیش ڕجام وهایە. ئەبو بەکریش لەسەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (د) بۆ خاتری دەست کەوتنی شەرەف و گەورەیی هاوڕێیەتی پێغەمبەر لەکۆچ کردن خۆی هێشتەوە لەدەرچوونی مەکە. بۆ سواری دوو ووشتری زۆرباشی دابەست بەئالیکو خدمەت چوار مانگ عایشە گوتی ڕۆژێک لەخانووی ئەبو بەکر دانیشتبووین لەگەرمای نیوەڕۆ کە زۆر گەرم بوو. عامری کوڕی فەهیرەی عەبدی ئەبو بەکر بە ئەبو بەکری گوت ئەمە پێغەمبەر (د) سەری خۆی داپۆشیوە لەکاتێکی وا کەقەت لەم کاتە نەهاتووتە لامان. ئەبو بەکر ڕوو بەڕوو بەپێغەمبەری گوت باوک و دایکم بەفیدات بێ والله لەبەر ڕوودانی کارێک نەبی تۆ لەم کاتە نەهاتیە دەرێ. پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسی لەلاتە دەریانکە دەرەوە. ئەبو بەکر گوتی هیچ کەسی بێگانە لێرە نییە هەر عائشەو دایکیەتی باوک و دایکم بەفیدات بێ ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی بەڕاستی من ئیزن دراوم لەمەککە دەرچم. ئەبو بەکر گوتی لەئارەزووی ئەوەدام کە ببمە هاورێت باوکم بەفیدات بێ پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەم ئارەزوودی تۆ ئەگەر خودا حەز بکا پێکدێ. ئەبو بەکر گوتی کەوایە یەکێک لەم دوو ووشترانەی کە دابەستراون بۆخۆت لێم قبوول بکەن. فەرمووی

بەفرۆشتن لێت قبول دەکەم (ئنجا بەهەشت سەد درهەم قەصواى لێ کڕى) قەصوا ناوى ووشترەکە بوو. ئنجا هەردوو ووشترەکانمان زۆر بەچوستى لەگەڵ پێویستى‌یەکانى سەفەر ئامادەکرد زادو زەخیرەى ڕێگامان بۆ لەنێو جەرابێک دانا ئەسمائى کچى ئەبو بەکر پارچەیەکى لەتەکبەندى خۆى پچڕى دەرکى جەرابەکەیان پێ بەست بۆیێ ناوبرا بە (ذات النطاقین) ولەڕۆژى پێنج شەم ئەبو بەکرو پێغەمبەر (د) گەیشتنە ئەشکەوتى چیاى (ثەور) لەخوارووى مەکە.

سێ شەو لەغارەکە مانەوە. عبدالله کوڕى ئەبو بەکر کە لاوێکى نەوجەوانى تازە پێ گەیشتوو بوو بەشەو لەغارەکە لەلایان بوو. لەسەرەتاى شەو کە تاریکى دادەهات لەپاش داکەوتنى تاریکى دەچووە لایان. لەئاخرى شەویش لەپێش ڕۆناکى دەهاتەوە ناو کافردکانى قوڕەیش گوایا وەکوو ئەوان شەو لەمەککە خەوتووە. بەهەموو تێ گەیشتن و زیرەکى خۆى بۆ وەرگرتنى قسەیەک کە پەیوەندى بەفێل و حیلەیەک بێ لە پێغەمبەر (د) بەڕۆژ لەمەککە ڕاى دەبوارد. بەشەو دەنگوباسى قوڕەیشى پێ ڕادەگەیاندن. عامرى کوڕى فوهەیرەش پارچە مەڕێکى بەدۆى لەدەوروپشتى غارەکە دەلەوەڕاند. شەویش مەڕەکەى لەسەر غارەکە دەنواند. هەموو سبەینەو هێوارەیش جامە شیرێکى بۆ دەدۆشین و دەیان خواردەوە. بۆ نەهێشتنى تام خاوى شیرەکەى بەبەردى گەرم دەکولاند. لەسەرەتاى بەیانیش دەنگى لەمەڕەکە دەدا بەشێوەیەکى وا ئەبو بەکرو پێغەمبەر گوێیان لێ بێ.

سێ شەو بەم تەرزە ڕایان بوارد. پێغەمبەر (د) و ئەبو بەکر پیاوێکى‌یان بەکرێ گرت لەتیرەى (بەنى د بل) بۆ شارەزایى ڕێگا لەپێش دەرچوونیان لەمەککە. پیاوەکەش ئەگەرچى کافربوو بەڵام بەپەیمانێکى زۆر قایم لێى ئەمین بوون. هەردوو ووشترەکانى سواریان دابە ئەو کە لەپاش سێ شەو بۆیان بباتە غارى ثەور ئنجا لەپاش سێ شەو ووشترەکانى بۆ بردن لەسبەینەى شەوى سێیەم کە دەکاتە ڕۆژى دووشەم عامرى کوڕى فوهەیرەو دەلیلەکە کە ناوى (عبداللەى کوڕى ئورەیقط) بوو بەگەلیان کەوتن. دەلیل (ڕێ پیشاندەر) ە کە ڕێگاى ڕۆخى دەریاى پێ گرتن (واتا بۆ ئەوەى ڕزگاریان بێ ڕێ گۆڕى پێ کردن). سوراقەى کوڕى مالکى کوڕى جوعشوم گوتى چەند نیردراوێکى قوڕەیش هاتنە لاى ئێمە گوتیان هەر کەسێک بەگرتن یا بەکوشتن محمدو ئەبو بەکرمان بخاتە دەست لەلایەن قوڕەیش دووسەد ووشتر وەردەگرى هەر لەو سەعاتە ئێمە دانیشتبووین لەنێو بەنى مەدلەجى قەومى خۆم یەکێکیان گوتى ئەى سوراقە ئێستا هەندێ کەسانم چاوپێ کەوت لەڕێگاى ڕۆخى دەریا لام وایە محمدو هاوڕێکانى بوون (سوراقە گوتى لەدڵى خۆم زانیم ئەوانن. بەڵام گوتم ئەوانەى تۆ دیوتە ئەوان نەبوون بەڵکى فلان و فلان بوون. لەپێش

چوی ئێمە سواربوون. ووشتریان بزر بوبو. مەبەستیشم لەهەڵ خەڵەتاندن و فەریب دانی پیاوەکە ئەوەبوو خۆم تەعقیبی ئەبو بەکرو محمد بکەم لەپێش کەسانی تر. بۆ ئەوەی دووسەد ووشترەکەی قورەیش تەنیا بۆمن بێ). سوراقە گوتی نەختێکی تر لە ئەنجومەنەکە خۆم ڕاگرت پاشان هەستام چوومەوە بەجاریەکی خۆم گوت وولاغەکەم ڕاکێشە دەرێ لەفلان جێگا لەپەنای تەپۆلکەیەک ڕای گرە خۆم دێم. جاریەکەم بەپشت خانوودا وولاغەکەی برد. منیش قوونکی ڕمەکەم لەعارد دەخشاند نەوە کەسێک بم بینێ کەوتمە شوێنی هەتا هاتمە لای وولاغەکەم سواری بووم. جەلەوم لێ بلند کردو ئاژۆتم بەئازایی هەتا لێیان بەنزیک کەوتم. وولاغەکەم هەلنگۆت من بەربوومەوە. هەڵستامەوە. دەستم بۆ تیردان برد فالێکم بەباسکە تیرگرتەوە. باشی نەهێنا دووبارە سواری وولاغەکە بوومەوە لەسەر پێچەوانەی فال و ئەزلام. کەوتمە شوێنی‌یان هەتا گوێم لەخوێندنی پێغەمبەر (د). پێغەمبەر (د) ئاوڕی نەدەداوە بەلام ئەبو بەکر زۆر ئاوڕی دەدایەوە. هەردوو دەستی وولاغەکەم تاکو ئەژنۆم ڕوو چووە عارد من بەربوومەوە عارد. بەڕاوەستاوی تێم ڕاخوڕی بەهەر حال بەتەکانێکی زۆر بەهێز دەستەکانی هاتە دەرێ کە نزیکیش بوو نێتە دەرێ وەکوو وولاغەکەم لەسەر چوارپەلی ڕاوەستا دیتم لەجێی دەستەکانی کە ڕووچوو بوو بەبێ ئاگر دووکەڵی لێ دەردەهات بۆ ئاسمان بلند دەبوو ئەم جارەیش فالێکم گرتەوە ئەم جارەیش باشی بۆ نەهێنام بەدەنگێکی بەرز هاوارم کرد (الأمان) ئنجا ڕاوەستان منیش سواری وولاغەکەم بوومەوە هەتا هاتمە لایان لەم ئەحوالی کە بەسەرم هات زانیم سەرکەوتن هەر بۆ پێغەمبەر (د) پێم گوت قورەیش دووسەد ووشتریان بۆ ئەوکەسە داناوە کە بە گرتن یا بەکوشتن ئێوە تەسلیمی ئەوان بکا. وە هەموو نهێنی‌یەکانی قورەیش و دەنگوباسی‌یان کە دەربارەی زەرەری ئەوان بێ پێم گوت. وە هەر خواردن و کەل و پەلێکی هەشم بوو پێم گوتن بۆ ئەوان بێ بۆخۆیان بیبەن قبوولیان نەکرد. پرسیاری هیچیشیان لێ نەکردم ئەمەندە نەبێ پێ‌یان گوتم ئاشکرامان مەکە) منیش بۆ ئەمین بوونم لەپاشە ڕۆژ و سەرکەوتنی پێغەمبەر (د) پێم گوت نامەیەکم بۆ بنووسە. ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمانی بەعامری کوڕی مالکی کوڕی فوهەیرە کرد لەپارچە چەرمێک ئەمنیەت نامەیەکی بۆ نووسیم پاشان پێغەمبەر (د) تەشریفی کەوتە ڕێ. لەڕێگا تووشی زوبەیری کوڕی عەوام هاتن لەنێو کاروانێکی موسولمانان کە بە بازرگانی و تجارەت لەشام دەهاتنەوە. بەزوبەیرو بەطەلحەی کوڕی عبیداللە دوو قەدە جلکی سپی‌یان لەبەر پێغەمبەرو ئەبو بەکر کرد. موسولمانانی مەدینەش. خەبەریان زانی بوو کە پێغەمبەر (تەشریفی لەمەککە دەرچووە. هەموو سبەینەیەک. بۆ پێشوازی هەتا عاردە چەقینەکەی دەرەوەی مەدینە دەهاتن ڕادەوەستان

هەتا گەرمایی نیوەڕۆ بۆ مەدینە دەگەڕانەوە. ڕۆژێک لەپاش چاوەڕێ کردن چووبوونەوە مالی خۆیان جوولەکەیەک دەچێتە سەر قەلاتێک لەقەلاتەکانیان بۆ ئیشێکی خۆی. چاوی بە پێغەمبەرو جەماعەتی دەکەوی. لەگەرمای بەهێزی هاوین لەناو سەراب و رمل سپی دەچن. جووەکە خۆی ڕانەگرت هەتا بەدەنگێکی بەرز بانگی کرد. نەی عەشیرەتی عەردب ئەمە خاوەن بەخت و دەولەتەکەتانە کە چاوەڕێتان دەکرد بێ ئەوا هات. هەر موسولمانە چەکی لەخۆی قایم کردو لەعاردە چەقینەکەی ناسراو بە (حەرە) لەدەرەوەی مەدینە بەخدمەت پێغەمبەر (د) گەیشتن. ئنجا پێغەمبەر (د) لەڕۆیشتن لای دەستەچەپی گرت لەڕێگای مەدینە بۆ جهەتی (قبا) لەگەلّ ئەو کەسانەی کە لەگەلّی دابوون. بەمێوانداری لەتیرەی بەنی عامری کوڕی عەوفی کوڕی مالکی کوڕی ئەوسی دابەزی لەڕۆژی دووشەمی یەکەم ڕۆژی مانگی (ربیع الاول). پاشان ئەبو بەکر بۆ بەجێ گەیاندنی هەلّستان بەپێویست بەرامبەر بەخەلّکی مەدینە لەبەرامبەر چاک و خۆشی و بەخێرهاتن لەگەلّ خەلّکی مەدینە بەکاری خۆی هەستا پێغەمبەریش بەکری دانیشتبوو. ئنجا بەشێک لەئەنصار کە پێغەمبەریان نەدیتبوو سەلام و بەخێرهاتنیان لەئەبو بەکر دەکرد لایان وابوو پێغەمبەرە. هەتا کاتێک پێغەمبەر (د) هەتاوی گەیشتێ. ئەبو بەکر چوو بەکورتەکی خۆی سێبەری لێ کرد. ئەجا عالەمەکە بەتەواوی پێغەمبەریان ناسی. ئنجا پێغەمبەر (د) چواردە شەو لە (قوبا) لەنێو تیرەی بەنی عەمری کوڕی عەوف مایەوە ئەو مزگەوتەی لەوێ دروست کرد کە ئایەتی (لمسجدٌ أُسِسَ علی التقوی) دەرحەق بەئەو هاتە خوارێ. پاشان پێغەمبەر (د) سواری ووشتری خۆی بوو ئەنصاریش لەگەلّی دەرۆیشتن هەتا گەیشتنە جێی - مزگەوتی ئێستای پێغەمبەر: لەجێی مینبەری حازر: ووشتری پێغەمبەر خۆی خستە عارد کە چەند لەئەنصاریش ئەو جێگایەیان کردبووە مزگەوت نوێژیان لێ دەکرد. لەوکاتە لەپێشتریش جێ مشتاغی خورما بوو ملکی سوهێل و سەهل بوو هەتیوبوون. سەعدی کوڕی زرارە بەخێوی دەکردن. وەکوو ووشتری پێغەمبەر لەوێ چۆکی دا. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەمە انشا الله قۆناغمانە. پاشان داوای هەتیوەکانی کرد. موعامەلەی عاردەکەی لەگەلّ کردن کە مزگەوتی لێ دروست بکات. هەتیوەکان گوتیان ئێمە بەفرۆشتن نایدەینە تۆ بەلّکی بۆ خودا بەهبە بەتۆی دەدەین. پێغەمبەر (د) ئەم هبەیەی قبوول نەکرد هەتا لیێ ی کرین.

پاشان دەستیپان کرد بەدروست کردنی مزگەوت پێغەمبەر (د) بەزاتی پیرۆزی خۆی لەگەلّ ئەصحاب خشتی دەکێشا دەشی فەرموو (**هذا الحِمالَ لاحِمالَ خیْبَر. هذا أبرُّ رَبَّنا وَأَطْهَـر**) یەعنی ئەم خشتە کە ئێمە هەلی دەگرین لای خودا بەخێرترەو پاکترە نەک ئەو

ـتی که ئەهلی خەیبەر هەڵیدەگرن لەخورماو مێوژ بەزەخیرە. (ش): ئەم بەیتە ئەگەرچی ـەبەحری ڕەجەزە و شیعرە. بەڵام بەگوێرەی پێغەمبەر شیعر دانان قەدەغەیەو نابێ ئەک ـوتنەوەی شیعر. وە دەیشی فەرموو (اِنَّ الأجْرَ أَجْرُ الآخِرة * فارحَم الأنصارَ وَالمهاجِرة). ئەمە شیعر نی‌یە: واتاکەی بەڕاستی پاداشت هەر پاداشتی قیامەتە * ئەی خودایا ڕەحم بەئەصحابی مەدینەو مەککە بکەی.

٩٨٥: عَنْ أَبي بَكْرٍ (ض) اسكُت يا أبابكْرٍ. اِثنانِ اللّهُ ثالثُهما.

**تەرجەمە**

٩٨٥: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی ئەبو بەکری صدیق ڕەزای خودای لێ بی لەخدمەت پێغەمبەر بووم (د) سەرم بلندکرد دیتم دوژمنەکانی قورەیش قاچیان دیاربوو. پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر هەندێ لەم کافرانە. چاویان شۆڕ بکەنەوە ئێمە دەبینن پێغەمبەر (د) فەرمووی بێ دەنگبە قسە مەکە ئێمە دوانین خودا سێ‌یەمینی ئێمەیە (بۆجی بەجێ کردنی پێویستی مان). هەروەکوو لەئایەتی پیرۆزیش فەرموویتی:(اِذ يقولُ لِصاحِبِهِ لاتَحزَنْ اِنَّ اللّهَ مَعَنا).

٩٨٦: عَن العَلاءِ ابنِ الحَضْرَمي (ض) ثَلثٌ للمهاجرِ بَعْدَ الصَدْرِ.

**تەرجەمە**

٩٨٦: دەگێڕنەوە لەعەلای کوڕی حەضرەمی ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی بۆ ئەصحابەکانی کۆچ کردوو (موهاجیر). کە لەمەدینە دەژیان لەپاش (طواف الصدر) واتا لەپاش طەوافی نیفاضەو (طواف الركن) کە لەپاش گەڕانەوە لە (منى) دەیکەن لە ٣ سێ ڕۆژ زیاتر لەمەککە گیربوون دروست نی‌یە.

(ش): ئەم حوکمە لەپێش فەتحی مەککە بوو لەپاش فەتح ئەم حوکمە هەڵگیرا.

٩٨٧: عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ض) لَوْ آمَنَ بي عَشْرَةٌ مِنَ اليهودِ لآمَنَ بي اليهودُ.

**تەرجەمە**

٩٨٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر

ده لەسەرۆکەکانی جوولەکە باوەڕیان بەمن بهێنایە جولەکەکانی کە سەر بەوان بوون باوەڕییان بەمن دەهینا.

(ش): سەرۆکەکانی مەشهورو ناسراو لەزەمانی هاتنی پێغەمبەر بۆ شاری (مەدینە). لە (بەنی نەضیر) ئەبو یاسری کوڕی ئەخطەب وە براشی حَي ئەخطەب و کەعب وەکەعبی کوڕی ئەشرەف وە ڕافعی کوڕی ئەبو حەقیق لە (بەنی قەینەقاعیش) عبداللەی کوڕی حەنیف و فەنحاص وە رفاعەی کوڕی یەزید وە (لەبەنی قورەیظەش) زوبەیری کوڕی باطیا وە کەعبی کوڕی ئەسەد وە شمویلی کوڕی یەزید. ئەمانەیش هیچیان موسولمان بوونیان ثابت و دیار نەبووە.

## (كتاب المغازي)

## باسی کوشتاری کافران

**٩٨٨: عَنْ اَنَسٍ (ض) مَنْ يَنْظُرْ ماصَنَع ابوجَهْلٍ فانطَلَقَ ابنُ مسعودٍ فوَجَدَهُ قَدْ ضَرَبَهُ ابنا عفراءَ حتّى بَرَدَ.**

### تەرجەمە

٩٨٨: دەگێڕنەوە لەئەنەس کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی کێ بی تەماشا بکا بزانی (ئەبو جەهل) چی بەسەر هات کوڕی مەسعود چوو دیتی هەردوو کوڕی عەفراء (مەعاذو مەعوذ) لێیاندابوو هەتا باریکە ڕوحێکی مابوو.

(ش): ئەم دووبرایە کوڕی حارث بوون عەفرای دایکییان کچی عوبەیدی کوڕی ثەعلەبەی نەجاریە بوو: لەپاش تەواوبوونی سەرکەوتن لەپاش کوشتاری شەڕی (بەدر) پێغەمبەر (د) ئەم حەدیثە پیرۆزەی فەرمووە. (یەکێکی تریش): ئەگەرچی (مەعاذو مەعوذ) دوو کوڕی عەفرا خاتوون ئەبو جەهلیان کوشت. بەڵام چونکی لەپێش ئەوان مەعاذي کوڕی عەمری کوڕی جەموح بەشیر قاچی بڕیبوو وە فڕەیدابووە سەر عەرد چەکو شمەکەکانی ئەبو جەهلی بە مەعاذی کوڕی عەمر بەخشرا لەلایەن پێغەمبەر (د).

**٩٨٩: عَنْ اَبي طَلْحَةَ (ض) يافُلانَ ابنَ فُلانٍ. وَيا فُلانَ ابنَ فُلانٍ. اَيَسُرُّكُمْ اَنَّكُمْ اَطعْتُمُ اللّهَ وَرَسولَهُ فانّا قَدْ وَجَدْنا ما وَعَدَنا رَبُّنا حقّاً فَهَلْ وَجَدْتُمْ ماوَعَدَ رَبُّكُمْ حقّاً. وَالّذي نفسُ محمَّدٍ بيَدِهِ ماأَنتُمْ بأَسْمَعَ لِما اَقولُ مِنْهُم.**

## تەرجەمە

٩٨٩: دەگێڕنەوە لە ئەبو طەلحە (زەیدی کوڕی طەلحەی ئەنصاری) ڕەزای خودای لێ ی. گوتی بەڕاستی پێغەمبەری خودا (د) ئەمری فەرموو بیستو چوار کەس لەگەورە گەورەکانی قوڕەیشی‌یان فڕەدا نێو بیرێکی هەڵنراو بەبەرد لەبیرەکانی بەدر. عادەتیش وبوو وەکوو غالب بوایە لەسەر قەومێک سێ شەو لەعاردێکی فرەوان لەو جێگایە دەمایەوە ئنجا لەڕۆژی سێیەم لەبەدر. فەرمانی کرد کە باریکەن ئەمری فەرموو ووشتری خۆم بۆ بینن. شمەکەکانی خۆی لێ قایم کردو ڕۆیشت. ئەصحاب کەوتنە شوێنی بەلام واتێ نەگەیشتن دەڕوا بەڵکی خەیالمان وابوو ئیشێکی خۆی هەیە هەتا ڕاوەستا لەسەر نێوی بیرێک ئیتر دستی کرد بەبانگ کردنی گەورە گەورەکانی قوڕەیش بەناوی خۆیان و بوکیان بەم تەرزە دەی فەرموو ئەی فلانی کوڕی فلان ئەرێ پێتان خۆش بوو ئەگەر گوێ ڕایەڵی خوداو پێغەمبەری خوداتان بکردایە بەڕاستی ئێمە گەیشتین بەو وەعدەی کە خودای ئێمە بەئێمەی داوە لەپاداشت بەڕاستی. ئایا ئێوەش گەیشتنە ئەو وەعدەی کە خودای ئێوە بەئێوەی دا لەعەزاب بەڕاستی و ثابت. ابو طلحە گوتی حەزرەتی عومەر پێی گوت قسەیان نەکردووە ئەو کەلاکانەی کە رووحیان تیا نەبێ پێغەمبەر (د) فەرمووی بەحەقی ئەو زاتەی کە روحی محمدی بەدەستە بۆ ئەو قسانەی کەمن بەوان دەڵێم ئێوە باشتر گوێتان لێ نی‌یە لەوان.

(ش): بۆ تەئییدی ئەم حەدیثە پیرۆزە. کە مردوو چی باوەڕ داربێ یان کافر. دەبیسێ و دەبینی وە خاوەنی هەموو هەستێکە لەخۆشی و ناخۆشی. چونکی بەڵگەکانی قورئان ئەمە دەڵێن. پێویست ناکا ئەم حەدیثە پیرۆزە بەجۆرێکی تر تەئویل بکرێ و مەعنای لێ بدرێتەوە. لەوانەی کە شێخی شەرقاوی رەحمەتی خودای لێ بی ڕۆنی کردووتەوە حەفتا کەس لە گەورەکانی قوڕەیش کوژران. بیست و چواریان فڕەدرانە یەک بیر. ئەوانی ترفرە درانە بیری جیا جیا.

٩٩٠: عَنْ رَفاعَةِ ابنِ رافع (ض) قالَ جاءَ جبريلُ اِلى النبيّ صلّى الله تعالى عَلَيهِ وسلم. فقالَ ماتعدّونَ اَهْلَ بَدْرٍ فيكُمْ. قالَ مِنْ اَفضلِ المسلمينَ قالَ وَكذلِكَ مَن شهِدَ مِنَ الملائكةِ.

## تەرجەمە

٩٩٠: دەگێڕنەوە لەرفاعەی کوڕی رافعی زرقی أنصاری ڕەزای خودایان لێ بی

یەکێک بوو لەحازرانی غەزای بەدر گوتی جبریل هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) پێ ی گوت ئێوە لەنێو خۆتان ئەوانەی لەشەڕی بەدر بەشدار بوونە بەچیان دەزانن فەرمووی بەگەورەترینی موسولمانانیان دەزانین. جبریل گوتی ئێمەیش ئەو مەلائکانەی ئامادەی غەزای بەدر بوونە بەگەورەترینی مەلائکانیان دەزانین.

٩٩١: عَنْ ابنِ عبّاس (ض) هذا جبريلُ آخِذٌ بِرَأسِ فَرَسِهِ عَلَيهِ أداةُ الحَرْبِ.

**تەرجەمە**

٩٩١: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) ڕۆژی بەدر فەرمووی ئەمە جبریلە سەری وولاغی خۆی گرتووە شمەکی کوشتاریشی لەبەرکردووە. (ش): لای کوری ئیسحاق پێغەمبەر (د) نەوعە بێخودیەکی بەسەرداهات لەپێش ئەوەی کوشتار دەست پێ بکا پاشان وەکوو بەهۆش هاتەوە فەرموی مژدەت لێ بێ ئەبو بەکر سەرکەوتنی خودات بۆ هات ئەمە جبریلە..هتد.

٩٩٢: عَنِ الرُّبيْعِ بِنتِ مُعَوِّذٍ (ض) لاتقولي هكذا وقولي ماكنتِ تقولِينَ.

**تەرجەمە**

٩٩٢: دەگێڕنەوە لەروبەیعی کچی موعەویذی کوڕی عەفرای ئەنصاری. ڕەزای خودای لێ بی گوتی سبەینەی ئەو شەوی کە تیا بەبووک چووم بۆ ئەیاسی کوڕی بەکیر ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) تەشریفی هاتە لای من هەندێ لەکچەکانی بچووکیش دەفیان لێ دەدا لەگەڵ باس کردنی چاکەکانی باوکم و مامم کەلەغەزای بەدر بەدەست عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل شەهید کرابوون هەتا لەکاتی بەدیارخستنی چاکەکان یەکێک لەکچەکان گوتی: (لەئێمە پێغەمبەرێک هەیە دەزانی چەڕوودەدا سبەینە- یەعنی ڕۆژی قیامەت). پێغەمبەر (د) لەبەر ئەوەی پێ ی خۆش نەبوو بلێن غەیب دەزانی چونکە نسبەت دانی زانینی غەیب بۆ مەخلوق نابێ فەرمووی وامەڵێ. وە هەر لەسەر ئەوەی کە ددت گوت بەردەوامبە.

(ش): پێغەمبەر (د) لەم فەرموودەیە هەر مەبەستی ئەمەبوو واز لەمەدحی ئەو بێنی. ئەگەرنا مەبەستی دەوام کردن نەبوو لەبەدیارخستنی چاکەکان. چونکی بەدیارخستنی چاکەکانی مردوان پەسند نی یە (مەکروهە) یا حەرامە (واتا پێ هەلگوتنی دونیایی نەک

چاکەکانی ئایینی و قیامەت چونکە باس کردنی چاکەکانی ئایینی و ڕۆژی دوایی لەو کارانەیە کە زۆر خێرە).

**٩٩٣: عَنْ أَبي طَلْحَةَ البَدْري (ض) لاتدخلُ الملائِكةُ بْيتاً فيهِ كَلْبٌ وَلا صورَةٌ.**

تەرجەمە

٩٩٣: دەگێڕنەوە لەئەبو طەلحە کە لەخدمەت پێغەمبەر (د) ئامادەی غەزای بەدر بووە. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی مەلائکە. بێجگە لەو مەلائکانەی کە پارێزگاری دەکەن ئەمرۆڤ کە ئایەتی (**لَهُ معقّباتٌ مِن بيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يحفظونَهُ مِنْ أمرِ اللّهِ**) ئاماژەی بۆ دەکات (واتا ئیشارەتی بۆ دەکا) وە بێجگە لەو مەلائکانەی پێیان دەڵێن (کرام الکاتبین) کە کردەوەکانی بەندە دەنووسنەوە) ناچنە خانوێک کە سەگێکی تیابێ یا وێنەی حەیوانێکی زیندووی تیابێ.

(ش): بەڵام وێنەیەک کە وێنەی زیندوو نەبێ وەکوو قەسرو خانوو باغ و داروبار زەرەری نی‌یە. موعەقباتیش دە مەلائکەن بەشەو وە دە مەلائکەن بەڕۆژ بە فەرمانی خودا بۆ پارێزگاری کردن نۆبەتی لەمرۆڤ دەگرن لە موصیبەتەکانی کە خودا تەقدیری کردبێ. لەئینسان دوور دەکەونەوە هەروەکوو (بەیضاوی) وای فەرمووە لەتەفسیری ئەم ئایەتە. ئنجا نە موعەقیبات نە کرام الکاتبین بەهیچ کاتێک لەئینسان جودا نابنەوە ئەم حەدیثەش هیچ پەیوەندی نەبوو لەگەڵ باسی جهادو غەزا. بەڵام چونکی ئەوی گێڕایتی‌یەوە کە ئەبو طەلحەیە بزانرێ لەڕێزی بەدریانە. بەم تەرزە چلۆن دەگوترێ ابو مسعود البدری مقداد البدری بیشگوترێ - ابو طه البدری- چونکی دوو حەدیث لەمەپێش ڕابوردرا. لەحەدیثی رفاعەی کە ئەهلی بەدر لەباشترینی موسولمانانن.

**٩٩٤: عَنْ أَبي مسعود البدريّ (ض) الآيتانِ مِنْ آخرِ سورةِ البَقرَةِ مَنْ قَرَأَهُما في ليْلَةٍ كفَتاهُ.**

**تەرجەمە**

٩٩٤: دەگێڕنەوە لەئەبو مەسعودی بەدری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەر کەسێک ئەم دوو ئایەتانەی لەدوایی سورەتی (بقره) بخوێنی لەشەوێک: واتا لەئایەتی (**آمَنَ الرَّسولُ**) هەتا دوایی سوورەت بەسە بۆ ئەو کە لەخراپی انسان و

ئەجنە دووركەویتەوە وە بێ نیازبی لەهەستانەوەی شەو (بەهۆی ئەوەی كە قورئ بخوێنی).

٩٩٥: عَنِ المقدادِ ابْن عمرو الكنديّ البدري (ض) أنهُ قالَ يارسول الله أرَأيْتَ إنْ لَقَيْتُ رَجُلاً مِنَ الكُفّار فاقْتَتَلْنا فَضَرَبَ إحدى يَديَّ بالسَّيْفِ فقَطَعَها ثمَّ لاذَ مِنّي بشَجَرَةٍ فقالَ أسلمْتُ للّهِ. أقتُلُهُ يارسول الله بَعْدَ أنْ قالها. فقالَ رسولُ اللّهِ صلى الله تعالى عليه وسلمَ لاتقتُلْهُ. فقالَ يارسول الله إنَّهُ قطَعَ احدى يَديَّ ثمَّ قالَ ذلِكَ بَعْدَ ماقَطعها فقال رسول الله لاتَقتُلْهُ. فأن قَتَلْتَهُ. فأنَّهُ بمنزِلتِكَ قبْلَ أنْ تقتُلْهُ وإنَّكَ بِمنْزِلَتِهِ قَبْلَ أنْ يَقولَ كلِمَتهُ الّتي قالَ.

## تەرجەمە

٩٩٥: دەگێڕنەوە لەمقدادی كوڕی عەمری كندی و بەدری ڕەزای خودای لێ بی بەم تەرزە بەپێغەمبەری گوت گوتی ئەی پێغەمبەری خودا. ئاگادارم بكە ئەگەر تووشی پیاوێك هاتم لەكافران كەوتینە كوشتار لەگەڵ یەكتریمان پاشان ئەو شیرێكی لەدەستێكی من دا دەستی بڕیم. پاشان گوتی من بۆخودا چوومە ناو ئایینی ئیسلام. گوتی لا اله الا الله ئایا بیكوژم لەپاش ئەوەی كە هاتە ناو ئایینی ئیسلام پێغەمبەر (د) فەرمووی مەیكوژە. مقداد گوتی ئەی پێغەمبەری خودا چلۆن ئەمە نەكوژم دەستێكی منی بەشیر بڕی پاشان گوتی هاتمە ناو ئایینی ئیسلام پێغەمبەر (د) فەرمووی مەیكوژە چونكی ئەگەر بیكوژی لەپێش كوژرانی وەكو تۆی لێ هات لەدین چونكی موسولمان بوو وە تۆش دەكەوی‌یە مەرتەبەی ئەو كە هێشتا هاتنە ناو دینی ئیسلامی بەسەرزاری دا نەهاتبێ. یەعنی چلۆن ئەو لەبەر كفر دەكوژرێ. تۆش لەبەر قصاص دەكوژرێی یەعنی لەحوكمی حەلال بوونی خوێنتان شریكن با هۆی حوكمیشتان جیاواز بێ بەم تەرزە لەتو (قصاصە) لەویشدا كفرە.

٩٩٦: عَنْ جُبَيْر ابْنِ مُطْعمْ (ض) لو كانَ الْمطعِمُ بْنُ عَديَ حيّاً ثمَّ كلَّمني في هؤلاءِ النَّتْنى لتركْتُهُمْ لَهُ.

## تەرجەمە

٩٩٦: دەگێڕنەوە لە جوبەیری كوڕی موطیعمی كوڕی عودەی ڕەزای خودای لێ بی

زیندوو بوایە چونکی موطعیم لەپێش غەزای بەدر وەفاتی کرد) بەداوای لێ بوردن (شەفاعەت) لەمنی بویستایەو قسەی لەگەڵ من بکردایە دەرحەق بە کەلاکە بۆگەنیەکانی گەورە گەورەکانی قورەیش کە لە غەزای بەدر فڕەدرانە نێو بیران ئەم دەکوشتن بۆ خاتری ئەو. بەلکی بە بێ وەرگرتنی تۆڵە (فدیە) بەزیندوویی وازم لێ دەهینان. (ش): لەبەر چاکەی دەرحەق بە پێغەمبەر (د) چونکی پێغەمبەر (د) وەکوو تەشریفی بە غەمناکی وە بەدلشکاوی لەطایف گەڕاوە لە تەک ئەوداو بۆ پارێزگاری لەئەو فەرمانی بەچوار کوری خۆی کرد کە بە چەکوو سیلاحی خۆیانەوە هەر یەکێک لەگۆشەیەکی بەیت ڕابوەستن. پاشان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو لاپەرەی کە قورەیش نووسیبوویان لەسەر زیانی بەنی هاشم کە لە شیعبی ئەبو طالب هەر لەئابلۆقە (موحاصەرە) دا بمینێن. توند ترینی ئەو کەسانەبوو کە ڕاپەڕین بۆ هەڵوەشاندنەوەی لاپەڕەکە.

## (قَتلُ كَعْبِ ابْنِ الأَشرف)
## (کوژرانی کەعبی کوڕی ئەشرەفی جولەکە)

٩٩٧: عَن جابِرٍ (ض) مَنْ لِكَعْبِ ابْنِ الأَشرَفِ فإنَّهُ قَدْ آذى اللّهَ وَرَسولَهُ. فقامَ محمّدُ ابْنُ مَسْلَمَةَ فقالَ يارسول اللّهِ اتحِبُّ اَنْ اَقتُلَهُ. قالَ نَعَمْ قالَ فأذَنْ لي اَن اَقولَ شيئاً. قالَ قُلْ. فلَمّا استمكَنَ مِنْهُ قالَ دونكُمْ فَقَتَلوهُ.

### تەرجەمە

٩٩٧: دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی کێ بی خۆی سازبدا بۆ کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف چونکی بە هەڵبەستە پیسەکانی زۆر قسەی بەخوداو پێغەمبەری خودا گوتوە وە قورەیشی‌یەکانی هانداوە لەسەر موسولمانان. محمدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری (بەنی عبدالشهلی) هەلستا ڕاوەستا. گوتی ئەی پێغەمبەری خودا حەزدەکەی من بیکوژم فەرمووی بەلێ حەزدەکەم. محمد گوتی کەوایە ئیزنم بدە ئەگەر قسەیەکی واشی لا بکەم پێ کەیف خۆش بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ماوەت دراوە هەرچی دەلێی محمد کوری سەلەمە چووە لای کەعب گوتی بەڕاستی ئەم پیاوە داوای ماڵ و زەکات و صەدەقەمان لێ دەکات بەڕاستی ئێمەی موکەلەف کردووە بۆیێش هاتومەتە لای تۆ قەردێکم لەگەڵ بکەی کەعب گوتی والله زیاتریش تووشی مەلولی و زەبوونی دەبن. محمدی کوڕی مەسلەمە گوتی چی بکەین ئەوا

تابعی بووینه. حەزناکەین ئێستا وازی لێ بینین هەتا دوایی کار بزانینی چی بەسەردێ. ئێستاش بەڕاستی بۆیێ هاتووینە لات لەزەخیرە بارێک یا دووبار ووشترمان پێ بدەی بەقەرد. کەعب گوتی باشە بەرەهن محمد گوتی رەهن چیت دەوێ. کەعب گوتی ژنەکانتان بەرەهن دانێن. محمد گوتی چلۆن ژنان لەرەهن دانییێن تۆ خۆت لەلاو چاکترینی عەرەبی ژنەکانمان حەزت لێ دەکەن کەعب گوتی کورو منالەکانتان لەرەهن دانێن. محمد گوتی چلۆن منالانمان لەرەهن دانییێن وا دەبی جنێو بەمنالیکمان دەدرێ پێی دەگوترێ تۆ هەر ئەوەبووی لەرەهن بارە گەنمێک دانرای ئەمەش بۆ ئێمە سووکی‌یەو عەیبە. بەلام زرێ و سلاحمان لەرەهن دادەنێین «بۆیێ محمد کوری مەسلەمە بۆ رەهن چەک و سیلاحی دان هەتا بەچەک و سیلاحەوە لەکاتی خۆی وەکوو هاتنە لای کەعب لەدەروونی خۆی ترسی لێیان نەبی). وەعدەشمان ئیمشەو بێ دێین. ئنجا محمد کوری مەسلەمە لەگەڵ برای لەشیری کە ئەبو نائلە بوو ناویشی سەلکانی کوری سەلامەی کوری وەقش بوو. بۆلای کەعب چوون بەشەو. بانگی کردن بۆ قەلات لەقاتی سەرەوە بۆیان هاتە خوارێ. ژنی گوتی لەم سەعاتە بۆ کوێ دەرۆی کەعب گوتی قەی ناکا محمد کوری مەسلەمەو برایەکەی لەشیریە. ژنەکە گوتی من دەنگێک دەبیێنم خوێنی لێ دەتکێ. گوتی قەی ناکا هیچ کەس نی‌یە محمد کوری مەسلەمەو برای لەشیریم ئەبو نائلەیە پیاوی بەشەرەف و بەرێزیش بەشەو با بۆ کوشتنیش دەعوەت بکرێ ناگەرێتەوە.

ئنجا سێ کەسیتر لەگەڵ محمدی کوری مەسلەمەو ئەبو نائلە چوونە نێو قەلات. یەکی‌یان ئەبو عەبس بوو. ناوی عبدالرحمن کوری جەبری ئەنصاری ئەشهەلی بوو. دووەم حارثی کوری ئەوسی کوری مەعاذ بوو سێیەم عەبادی کوری بیشری کوری وەقشی رابوردوبوو. پاشان محمد کوری مەسلەمە بەهەر چواریانی گوت وەکوو کەعب هاتە لامان من بەبەهانەی بێن کردن پرچی سەری دەگرم بێن دەکەم. وەکوتێ گەیشتێ دەستم باش لەپرچی سەری گیربووە. ئێوەش بیدەنە بەر شیران ئنجا کەعب لەکۆشک و بالاخانە بۆلایان هاتە خوارێ. بەشمەکی جوانی پڕ لەبێنی خۆش. محمد کوری مەسلەمە گوتی ئیمرۆ بێنێکی وام بۆ دێ قەت بێنی وا خۆشم نەدیوە. کەعب گوتی ئەم بێنە لای منە. تازە ژنێکم هێناوە لەکچە گەورەکانی عەرەب بۆ خاتری ئەو بەبۆنی خۆش خۆم بۆندار کردووە محمد گوتی ئیزنە سەرت بۆن بکەم گوتی بەڵێ: پرچی سەرم گرت و بێنم کرد پاشان بەهەوالەکانیشم گوت ئێوەش بێن بکەن. محمد وەکوو زانی دەستی باش لەپرچی سەری گیربووە گوتی دەی دایگرن بەشیران لەوێ کوشتی‌یان و هاتنەو خدمەت پێغەمبەر (د) هەوالی کوشتنیان پێ گەیاند (کوژرانی کەعب لەسالی سێیەمی کۆچی لەمانگی ربیع

الاول بوو چەند بەسەردا هەڵدانێکی بەهەڵبەست بەسەر گەورە گەورەکانی قورەیش دا هەڵگوتبوو کە لەشەڕی بەدر کوژرابوون).

## قتل عبدالله ابن ابي الحقيق ويقال ابي رافع سلام
## کوژرانی ئەبو رافع سەللامی کوڕی ابو الحقيق

٩٩٨: عَنْ عبدالله ابن عتيكٍ قالَ لَما انكَسَرَتْ ساقي بَعْدَما قتلْتُ ابا رافع اليهوديّ. قالَ رسول اللّهِ ابسُطْ رِجْلَكَ فبَسَطْتُ رِجلي فَمَسحها فكانّها لَمْ اَشْتِكها قطّ.

### تەرجەمە

٩٩٨: دەگێڕنەوە لەبەرائی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمانی دا بەعبدالله کوڕی عەتیکەی زەکوانی وە بەمەسعودی کوڕی سەنانی ئەسلەمی و بە عبداللەی کوڕی ئونەیسی جوهنی. وە بە ئەبو قەتادەی ئەنصاری لەژێر سەرکردایەتی عبداللەی کوڕی عەتیک بۆ سەر ئەبو رافع بڕۆن. چونکی زۆر پێغەمبەری ئەزیەت ددا. لەخاکی حیجاز قەلاتێکی هەبوو. وەکوو. لەقەلاتەکەی بەنزیک کەوتن ڕۆژیش ئاوابوو. شوان و گاوانیش بەمالاتی خۆیان گەڕانەوە لەدەشت عبدالله کوڕی عەتیک بەهەواڵەکانی گوت. ئێوە لێرە دانیشن. من دەچم بەقسەی خۆش و بەفێلێک لەدەرگەوانەکە بەلکی دەچمە ژووری قەلاتەکە. عبدالله ڕۆیی تا نزیک دەرگە. خۆشی داپۆشی بوو بەجلکی خۆی هەتا نەناسرێ گوایا ئیشێکی هەیە خۆی دواخست. دەرگەوانەکە بانگی کرد ئەی بەندەی خودا ئەگەر بیر لەوە دەکەیەوە بێیە ژۆرێ. وەرە ئەگەر نا دەرگاکە کلیل دەدەم. منیش چوومە ژورێ لەتەویلەیەکی کەران لەنزیک دەرگەی قەلات خۆم شاردەوە. وەکوو عالەم هەموو چوونە ژوورێ. دەرگای کلیل دا وە کلیلەکانی بەسنگێک وەکرد منیش کلیلەکانم هێنا دەرگەی قەلاتم کردەوە. ئەبو رافعیش عادەتی وابوو حیکایەتی‌یان بۆ دەکرد. چاوەڕێم کرد هەتا قسەکەرو حیکایەت بێژ ڕۆیشتن. لەچەند نهۆم لەسەر یەکتری لەهۆدەی هەرە سەرەوە دابوو منیش بۆی هەوراز چووم هەر دەرگەیێکی دەم کردەوە لەژۆریش کلیلم دەدایەوە. بەم فکرە دەم گوت ئەگەر خەلک پێش بزانن بەمن ناگەن هەتا من ئەبو رافع دەکوژم. خولاصە لەهەموو هۆدەکان سەرکەوتم تا گەیشتمە هۆدەی ئەبو رافع لەنێو ماڵ و خێزانی درێژبوبو. چرایش نەبوو لەبەر تاریکی نەم دەزانی کامە هەوە وە لەکوێ خەوتووە.

منیش بانگم کرد - نەی ئەبا رافع- گوتی ئەمە کێیە شیرێکم راوەشاند بۆلای دەنگەکە. لێدانەکەم بێ سوود بوو. سەر سورمانێک گرتمی. هاواری کرد. منیش لەهۆدەکە هاتمە دەرەوە نەختێ بێ دەنگ بووم پاشان چوومەوە ژوورێ گوتم ئەم دەنگە چی بوو نەی ئەبو رافع. گوتی هاوار بۆ دایکت پیاوێک لەژوورێیە شیریکیشی بۆمن راوەشاندو لێی دا. منیش لەکاتی قسەکانی شیرێکی ترم راوەشاند ئەگەرچی لێدانی ئەم جارەم بەفیرۆ نەچوو جێگای خۆی گرت بەڵام بەمەندەش وازم نەهێنا تیژایی دەمی شیرم لەسەر وورگی دانا تا لەپشتی دەرچوو. تێ گەیشتم کوشتم ئنجا دەرگەکانم یەک یەک کردەوە هەتا گەیشتمە جێگایەک لام وابوو عەردە کەچی ناردوانیش بوو (قادرمە) چونکی چاوەکانیشی کزبوو. منیش بەمەبەستی عەرد هەنگاوم هاوێشت لەچەند قادرمەیێک بەربوومەوە سەر عارد قاچێکم شکا. بەمێزەرەکەم بەستمەوە. لەسەر دەرگەی قەڵاتەکە دانیشتم گوتم ناڕۆم هەتا یەقین نەکەم ئەم کافرەم کوشتووە. پاشان وەکوو کەلەشێر دەستیان بەخوێندن کرد. خەڵکی لەخەو هەستان. لەسەر شوورەی قەڵات بانگییان کرد. بازرگانی خەڵکی حیجاز ئەبو رافع کوژرا منیش بەهەواڵەکانەوە هاتینەوە خدمەت پێغەمبەر (د) حیکایەتم بەتەواوی پێ گوت فەرمووی قاچت ڕاکێشە منیش قاچە شکاوەکەم ڕاکێشا دەستێکی پیرۆزی بەسەردا هێنا. گۆیا لەحەیاتی خۆم من ئەم قاچەم هەر نەشکاوەو ببڕای ببڕای نێشی نەبوو.

## (غزوة أحُد)
## باسی شەڕی ئوحود

٩٩٩: عَنْ جابِرٍ (ض) قالَ رَجُلٌ للنبيِّ صلى الله تعالى عليه وسلم يَومَ أُحُدٍ أرأيْتَ إن قُتِلْتُ فايْنَ أنا. قالَ في الجنَّةِ فالقى تَمراتٍ في يَدِهِ فمَّ قاتَلَ حتّى قُتِلَ.

### تەرجەمە

٩٩٩: دەگێڕنەوە لەجابری کوری عبداللەی ئەنصاری رەزای خودای لێ بی. گوتی پیاوێک هەندێ قەسپی لەدەست دا بوو دەی خوارد. لەغەزای ئوحود هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) پێی گوت پێم بلێ ئەگەر من بکوژرێم لەکوێم پێغەمبەر (د) فەرمووی لەبەهەشت. پیاوەکە گوتی من نەگەر بمێنێم تا ئەم قەسپە دەخۆم ژیانێکی درێژم هەیە. قەسپەکانی فرەدا. خۆی بەلەشکری کافران دادا کوشتاری کرد هەتا شەهید کرا. (ش): ئەو ڕووداوە خۆی لە غەزای بەدریش ڕووی دا. بەم تەرزە عومەیری کوری حومام خورمای

بەدەستەوە بوو. پاشان وەکوو پێغەمبەر (د) لەپاش پرسیار خەبەری بەهەشتی پێ دا. خورمای فڕەدا خۆی بەدوژمن دادا هەتا شەهید کرا. بەڵام لەلایەن زانایانی حەدیث ناوی ئەو پیاوەی نوحود دیاری نەکراوە.

١٠٠٠: عَنْ سَعْد ابْنِ اَبي وقّاص (ض) اِرْمِ فِداكَ اَبي وَأُمّي.

**تەرجەمە**

١٠٠٠: دەگێڕنەوە لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەغەزای نوحود پێغەمبەر (د) کیسەی تیرانی بۆمن هەڵڕێژت فەرمووی باوێ باوک و دایکم بەقوربانت بێ.

١٠٠١: عَنْ اَنَسٍ (ض) كيفَ يُفلِحُ قَومٌ شجّوا نبيُّهُمْ.

**تەرجەمە**

١٠٠١: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەغەزای نوحود پێغەمبەر (د) سەری پیرۆزی شکا. ددانی پێشەوەی شەهید کرا. دەشی فەرموو چلۆن ڕزگاری دەبی قەومێک سەری پێغەمبەری خۆیان بشکێنن بانگیشیان بکا بۆ خواپەرستی بەدەستی پیرۆزیشی خوێنی لەڕووی پیرۆزی دەستڕی‌یەوە لەم کاتە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ (ليسَ لَكَ مِنَ الامــرِ شـئٌ) واتا هەر خودا خاوەنی کاروباری ئەوانە ئینجا یا لەناویان دەبات یان دەیان شکێنی یا لەپاش ئیسلام تۆبەیان لێ قبوول دەکات. یان عەزابیان دەدا لەپاش سووربوونیان لەسەر کافری. هیچ لەدەست تۆ نی‌یە. تۆ هەر ناردراوی ئامۆژگاریان بکەی و شەریان لەگەڵ بکەی- یەعنی تەسلیم بە. واتا خودا هیچی لەدەست کەس نەناوە دەرمانی هەموو شتێک تەسلیم بوونە بۆ فەرمانی خودا.

١٠٠٢: عَنْ ابْنِ عُمَرَ (ض) سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنا لَكَ الحَمْدُ. اللهُمَّ العَنْ فُلاناً وفلاناً قالَهُ في قُنوتِ الفجرِ.

**تەرجەمە**

١٠٠٢: دەگێڕنەوە لەعەبدالله کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی. بەراستی

بیستبووی له پێغەمبەر (د) وەکوو سەری له ڕکوع ڕاست دەکردەوە لەرکعەتی دوایی نوێژی سبەینه لەپاش (سمع الله لِمَن حَمِدهُ) دەی فەرموو یاخودا لەعنەت لەصەفوانی کوڕی ئومیەی کوڕی خەلەفی جەمحی وە لەسەهلی کوڕی عەمری قورەیشی و عامری وە نە حارثی کوری هشام کوڕی موغیرەی قورەشی مەخزومی بکەی خودای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأمرِ شيءٌ أو يتوبَ عليهِمْ أو يعذبُهُمْ فإنَّهُم ظالِمون). لەسەر ڕای زانایان هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەگەرچی لەبەر چەند هۆیەک بووە. بەلاّم هەر لەغەزای ئوحود بووە چونکی چەند شتێک ڕووی دا لەکافران پێویستی دەکرد نەم دوعایە بکرێ (یەکی‌یان) پێغەمبەر (د) ددان و سەری پیرۆزی شکا وەکوو حەدیثی ئەنەس گوترا (دووەم) حەمزەی مامی شەهید کرا. جەستەی پیرۆزیان ناشیرین کرد بەبرینی هەندێ لەئەندامانی لەشی ئەمە زۆر کاری لێ کرد خودای گەورەش زانابوو بەوەی ئەمانەی دوعایان لێ دەکرێ زۆریان موسولمان دەبن. هەتا ئەم سێ کەسانەی کە بەتایبەتی دوعای لەعنەتی لێ کردن لەفەتحی مەککە موسولمان بوون و موسولمان بوونەکی باشیان ڕاگرت. ئنجا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دوعا بە لەناوبردنی کافران نەکا. لەبەر ئەوەی کە خودای گەورە دەزانی ئەمانە لەپاشە ڕۆژ موسولمان دەبن کە زۆریش لەئازاردانی موسولمانەکانی کە لەسەرەتای ئیسلام موسولمان بوون بەشداربووینە.

## قتل حمزة ابن عبدالمطّلب

## شەهید کرانی ئیمامی حەمزەی مامی پێغەمبەر (د)

**١٠٠٣: عَنْ وَحْشِيٍّ (ض) أَنْتَ وَحْشِيٌّ. قُلْتُ نَعَمْ قالَ أنتَ قَتَلْتَ حمزَةَ. قلْتُ قد كانَ مِنَ الأمرِ ماقَدْ بَلَغَكَ. قالَ فَهَلْ تستطيعُ أَنْ تغيبَ وَجْهَكَ عنّي فَخَرَجْتُ.**

### تەرجەمە

١٠٠٣: دەگێڕنەوە لەعبیداللەی کوڕی عودەی کوڕی خیار کوڕی عودەی کوری نەوفەل کوری عەبدی مەناف. بەوەحشی گوت ئەرێ تۆ خەبەرمان پێ نادەی بەکوشتنی حەمزە. گوتی بەڕاستی لەغەزای بەدر حەمزە طوعەیمەی کوری عودەی کوری نەوفەل کوری عەبدی منافی کوشت. گەورەکەم (سێد) کە جوبەیری کوری مەطعەم بوو. برازای طوعەیمەی کوژراویشبوو. گوتی ئەگەر تۆ حەمزە بکوژی. ئازاد دەبی. لەجیاتی خوێنی مامم طوعەیمە. گوتی ئنجا لەشکری قورەیش دەرچوون له عەینەین (عەینەین کێوێکە لەکیوەکانی ئوحود

بەینی لەگەڵ ئوحود شیویکە) منیش بەگەڵ لەشکر کەوتم بۆ کوشتار وەکوو لەشکر بۆ کوشتار ڕیزی بەست. سباعی کوری عبدالعزی ی خوزاعی لەنێو لەشکر هاتە دەرێ گوتی کێ هەیە بۆمن بێتە مەیدان. حەمزەی کوری عبدالمطلب بۆی دەرچوو. گوتی ئەی سباعی کوری داک ئەنماری گیلکەبڕ (چونکی ئەنماری دایکی) کچی سونەت دەکرد. تۆ بەربەرەکانێی خوداو پێغەمبەری خودا دەکەی لنگی دایە سەر بەبێ ڕاوەستان کوشتی. گۆیا زەمانی دوێنێ بوو ڕۆیی هەتا هەتایە. منیش لەپەنای بەردێک لەحەمزە خۆم لەبۆسە نابوو وەکوو لێم بەنزیک کەوت. دیتم خوار ناوکی زرێی لەسەر لاچووبوو بەنیشانە زەرگێکم بۆ ڕاوەشاند لەپشتەوە لەبەینی دووسمتی هاتە دەرێ. بابەتی شەهید بوونەکەی وابوو پاشان لەشکر گەڕاوە منیش لەگەڵ لەشکر گەڕامەوە. لەمەککە دانیشتم هەتا ئیسلامەتی سەرکەوت. پاشان بو (طایف) ڕۆیشتم خەڵکی طایف لەساڵی هەشتەمی کۆچی چەند نێردراوێکیان ڕەوانەکرد لەپاش فەتحی مەککە بو خدمەت پێغەمبەر (د) هەتا موسولمان بێن. عاردم لەسەر تەنگبوو. هەندێ جار فکرم دەکرد بۆ شام بڕۆم. هەندێ جار خەیاڵی یەمەنم دەکرد. من لەم بیرانە (فکرانە)دا بووم. پیاوێک لەناکاو پێی گوتم وای بۆ حالی تۆ. بەڕاستی واللە پێغەمبەر (د) هیچ کەسێک ناکوژی کە بێتە سەر ئایینی ئەو. منیش بەگەڵ نێردراوەکانی طایف کەوتم. هەتا هاتمە خدمەت پێغەمبەر (د) وەکوو چاوی بەمن کەوت. فەرمووی ئەرێ تۆ (وەحشی). وەلامم داوە: بەڵێ. دووجار لەسەریەک. فەرمووی ئەرێ تۆبووی حەمزەت کوشت تۆ بووی حەمزەت کوشت. گوتم هەر چلۆنێکی بیستوتە لەدەستم قەوما. فەرمووی پێت دەکرێ خۆت نیشانی من نەدەی. منیش جێبەجێ لەخدمەتی هەڵستام ڕۆیشتم پاشان خاوەنی یەمامە (موسەیلەمەی کذاب) بەکەمێک لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (د) بە داواکردنی پێغەمبەرایەتی لەشکرێکی زۆری بۆ سەر هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ئەصحاب) کۆکردبۆوە. حەزرەتی ئەبو بەکریش لەژێر سەرکردایەتی خالدی کوری وەلید لەشکری ئامادەکرد. منیش گوتم واباشە لەگەڵ لەشکری ئەصحاب بچم. بەلکی سەرکەوتوو دەبم لەبەرامبەر ئیمامی حەمزە موسەیلەمەی کەذاب بکوژم چاوم لەموسەیلمە دەگێڕا. دیتم پیاوێک لەکەلەنی دیوارێک وەکوو ووشترێکی ڕەنگ ئەسمەری ڕەمادی (بۆر) ڕاوەستاوە پرچی سەریشی بەڕووتی بڵاوکردووتەوە.

بەنیشانە بۆ بەینی هەردوو گۆی مەمکی زەرگێکم بۆ هاوێشت لەبەینی هەردوو شانی چووە دەرێ. عبداللە کوری زەیدی کوری عاصمی مازنی ئەنصاری غاریدا سەری سەرکی دابەر شیران هەتا تەواوی کرد.

١٠٠٤: عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ض) اشتَدَّ غضب اللّه على قَوْم فعلوا بنبيّهِ. يشيرُ الى رباعيته. اشتَدَّ غضب اللّهِ على رَجُلٍ يقتلُهُ رسول اللّهِ صلى اللّه تعالى عليه وسلم في سبيل الله.

### تەرجەمە

١٠٠٤: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) (وەکو شاددانی لای خوارەوەی لای ڕاستی شکا لەغەزای ئوحود. لەدەست عوتبەی کوری ئەبی وەقاص برای سەعد. لێوی پیرۆزی خوارەوەشی زامدار بوو). توندو بەهێزبوو توورەیی خودا لەسەر قەومێک. وا لەپێغەمبەری ئەو بکەن. توندو بەهێزبوو ڕک و توورەیی خودا لەسەر پیاوێکیش کە پێغەمبەری خودا بیکوژێ لەرێگای خودا. هەروەکوو لەغەزای ئوحود (ئوبەی کوری خەلەفی حەجمی) کوژرا لەدەست پێغەمبەر (د).

(بۆچوونی دانەر): چونکی خودای گەورە بۆ میهرەبانی بەخەڵک پێغەمبەران دەنێری بۆ ئازاردان نانێری ئنجا دەرحەق بەخودا تا یەکجار بێ تامی نەکەن لەرێ بزرکردن لەگەورەیی پێغەمبەران ناودشێتەوە بەبێ پێویست دەستی پیرۆزی خۆیان بەکوشتنی جەستە پیسەکانی گاوران پیس بکەن.

١٠٠٥: عَنْ عائِشَةَ (ض) مَنْ يَذهَبُ في أَثَرِهِمْ.

### تەرجەمە

١٠٠٥: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی وەکوو پێغەمبەر (د) ڕوویی پیرۆزی بریندار بوو ددانی پیرۆزی شەهید کرا کافرەکانیش ڕۆشتن گەیشتنە جێگایەک پێی دەلێن (حمراء الاسد). کە سێ میل لەمەدینە دوورە. بۆ ترساندنی دوژمن پێغەمبەر (د) فەرمووی کێ بۆ بەدواداچوونی دوژمن ئەکەوێتە شوێنییان. هەفتا کەس لەو موجاهیدانەی بەشداری شەری ئوحودیان کرد دەکەونە شوێنییان هەفتاکەسی لە موجاهیدانی شەری ئوحود وەلامیان داوە وەکوو ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی و زوبەیرو عەماری کوری یاسرو طەلحەو سەعدی کوری ئەبی وەقاص و عبدالرحمن ی کوری عەوف و ئەبو حوذەیفەو کوری مەسعود. ڕەزای خودایان لێ بی. چونکی لای کوری ئیسحاق و ئەوانی تریش ئەبو سفیان بەلەشکرەوە وەکوو گەیشتنە ئەو شوێنەی پێی دەلێن (حمراء الاسد). ترسێکیان کەوتە نێو دڵ ئنجا ئەصحابەکانی بەرێز هەرچەندە کەوتنە

شوێنیشیان. بەڵام کافرەکان لەترسان ڕۆیشتن خۆیان ڕانەگرت. ئنجا دەرحەق بەوانەی بەشداری شەڕی ئوحودیان کرد کە بەدوو کافرەکان دا چوون ئایەتی (الّذينَ استجابوا لِلّهِ والرّسولِ مِن بَعْدِ ماأصابَهُمُ القَرْحُ لِلّذينَ أحسنوا مِنهمْ واتّقوا أجرٌ عظيم) هاتە خوارێ.

## (غزوة الخندق)
### غەزای خەندەق یان ئەحزاب

١٠٠٦: عَنْ جابرٍ (ض) أنا نازِلٌ. فَأخَذَ المِعْوَلَ فَضَرَبَ فَعادَ كثيباً أهْيَلَ.

### تەرجەمە

١٠٠٦: دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودایان لێ بی گوتی لەساڵی چوارەمی کۆچی لەغەزای ئەحزاب. کە دەهەزار کەس لەقورەیش و غەطفان و جوولەکەو تیرە جۆر بەجۆرەکانی عەرەب هاتنە سەر مەدینەی پیرۆز. بەئاماژەی (ئشارە)ی سەلمانی فارسی، پێغەمبەر (د) فەرمانی دا لەدەورەی شاری مەدینە خەندەک لێ بدرێ. خۆشی ئیشی تیادەکرد- تووشی پارچە عەردێک هاتین لەبەر توندو ڕەقی کولینگ کاری لێ نەکرد هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) پێیان گوت (هذه كُدْيَةٌ عَرَضَت في الخندقِ) یەعنی ئەمە پارچە عەردێکی زۆر سەختە بەدیارکەوت لەخەندەق. پێغەمبەر (د) فەرمووی من شۆڕ دەبمەوە نێو خەندەک. زگی پیرۆزیشی بەبەرد پێچابوو لەبرسان چونکی سێ شەوو ڕۆژ بوو هیچ شتێکمان تام نەکردبوو. ئنجا کولنگی وەرگرت وەکوو لەعاردە سەختەکەی دا. بوو بە زیخێکی شل.

١٠٠٧: عَنْ سُلَيمانَ ابْنِ صُرَدٍ (ض) نغزوهم ولايَغزوننا قالَهُ يوْمَ الاحزابِ.

### تەرجەمە

١٠٠٧: دەگێڕنەوە لەسولەیمانی کوڕی صەردی کوڕی جەونی خوزاعی کە یەکێک بوو لەئەصحاب و یارانی ناسراوی پێغەمبەر. گوتی وەکوو قورەیش ڕۆیشتن ڕۆژی ئەحزاب پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێمە غەزای ئەوان دەکەین. ئەوان غەزای ئێمە ناکەن (واتا ئێمە جێگای ئەوان دەگرین ئەوان جێگاو شوێنی ئێمە ناگرن.

(ش): ئەم حەدیثە یەکێک بوو لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی چونکی بەڕاستی سالّی ئایندە بەنی‌یەتی عومرە هەتا حودەیبە چوو قورەیشیش قەدەغەیان کردو هودنەیان کرد. پاشان قورەیش هودنەیان شکاند. شکاندنی هودنەو شەڕ ڕاگرتن بوو بەهۆی ئەوەی کە مەککە فەتح بکەن.

١٠٠٨: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لا الهَ اِلاّ اللّهُ وَحْدَهُ وَاَعزٌ جُنْدَهُ. وَنَصَرَ عَبْدَهُ. وَغَلَبَ الأحزابَ وَحْدَهُ فلاشيءَ بَعْدَهُ.

**تەرجەمە**

١٠٠٨: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) دەی فەرموو لەڕۆژی ئەحزاب. هیچ پەرستراوی بەڕاست نی‌یە تەنیا خودا نەبێ. سەری خست لەشکری خۆی کە لەشکری باوەڕدارانە. وە یاریدەی بەندەی خۆی دا کە محەمەدە (د) وە سەریش کەوت بەسەر تیرە جۆرە بەجۆرەکانی کافران بەتەنیا. ئنجا هیچ شتێک مەوجود نی‌یە لەپاش ئەو. یەعنی مەوجود هەر ئەوە. ئەشیا هەمووی نەبووەو (مەعدوومە).

## (غَزْوَةُ قُرَيْظَة)
## شەڕی - بەنی قورەیظە

١٠٠٩: عَنْ اَبي سَعيدٍ الخُدْرِي (ض) قوموا الى سيدكُمْ أو خيْركُمْ فقالَ هؤلاءِ نَزَلوا عَلى حُكمِكَ. فقالَ تقتُلُ مُقاتِلَتَهُمْ وَتَسْبي ذِراريُّهُمْ. قالَ قَضَيْتَ بِحكْمِ اللّهِ أو بحُكم المَلِكِ.

**تەرجەمە**

١٠٠٩: دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی بەنو قورەیظە کە لە کۆشک و قەلاّت و شوێنە قایەکانی شەڕ هاتنە خوارێ. بۆ تەسلیم بوون لەسەر حوکمی سەعدی کوڕی مەعاذی سەروکی ئەنصار لەپاش ئابلۆقەدرانیان واتە موحاصرە کران بۆ ماوەی پازدە شەوو ڕۆژ. پێغەمبەر (د) ناردیە شوێن سەعد. بەناساغی بەسواری گوێ درێژێک هێنایان. وەکوو لەو مزگەوتەی کە لەبەنی قورەیظە کرابوو بۆ نوێژ لەماوەی ئابلۆقەدرانیان بەنزیک کەوت. پێغەمبەر (د) فەرمانی بەئەنصاری کرد بچۆن سەرۆکی

خۆتان دابەزێن. پاشان فەرمووی ئەی سەعد. قەومی بەنی قورەیظە تەسلیم بووینە لەسەر هەر حوکمێکی کە تۆ دەرحەق بەوان ڕەوا ببینی. سەعد گوتی حوکمی من ئەمەیە شەرکەرەکانیان بکوژن ئافرەت و منالیشیان ئەسیر بکەن پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی بەحوکمی خودا دەرحەق بەوان تۆ حوکمت کرد. یا فەرمووی بەحوکمی ملیک. مەبەستیش لە الله و مەلیک هەر خودای گەورەیە.

لە (عینی) دەڵێ: ئنجا پیاوەکانی شەرکەریان شەش سەد کەس بوون هەموویان لەدوو خانوان کۆکردەوە چەند خەندەکی‌یان هەلکەند بۆ ئەوەی خوێنی ئەوانی بچیتە ناوی بۆ خەندەکەکان. ئافرەت و منالیشیان لەسەر موسولمانان دابەش کرد (ئەم غەزای بەنی قورەیظە لەڕۆژی دوایی ئەحزاب بوو).

## غَزْوَةُ ذاتِ الرِّقاعِ
## (غەزای ذات الرقاع)

**١٠١٠: عَنْ جابِرٍ (ض) إِنَّ هذا اخْتَرَطَ سيفي وَأَنا نائِمٌ. فاستَيقظتُ وَهوَ في يَدِهِ صَلْتاً فقالَ لي مَنْ يَمْنَعُكَ مِنّي قُلْتُ لَهُ اللّهُ فها هوذا جالِسٌ.**

### تەرجەمە

١٠١٠: دەگێرنەوە لەجابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری ڕەزای خودایان لێ بی لەخدمەت پێغەمبەر (د) چووبووە غەزا بۆلای نەجد. گوتی وەکوو لەغەزای نەجد گەڕاینەوە. لەشیوێکی پڕ لەدارو درەخت گەرمایی‌یەکی سەختمان تووشبوو. پێغەمبەر (د) لەوێ دابەزی لەژێر سێبەری دارێکی نێو (سومەرە) واتا دارقەزوان. حەسایەوە شمشیریشی بەلقی دارێکەوە ئاوەسی. ئێمەش بلاوەمان کرد بەناو دارو درەختەکاندا هەر یەکێک چووە ژێر سێبەرێک. کەمێک خەوتنی. لەناکاو پێغەمبەر (د) بانگی ئێمەی کرد. هاتینە خدمەتی وەکوو دیتمان عەرەبێکی بیابان نشین (بدوی) لەخدمەتی دانیشتبوو. فەرمووی ئەم بەدەویە شیرەکەی منی لەکالان دەرهینا من لەخەودابووم بەخەبەر هاتم دیتم شمشیری بەڕووتی بەدەستەوەیە. بەمنی گوت کێ تۆ نەجات دەدا لەدەست من. گوتم خودا. ئێستاش ئەوە دەی بینن لێرە دانیشتووە.

(ش): لای کوڕی ئیسحاق سەلمێندراوە کە جبریل هات پالێکی بەسینگی وەنا. شیری لەدەست بەربۆوە پێغەمبەر (د) شیرەکەی هەلگرتەوە فەرمووی کێ تۆ نەجات دەدا لەدەست

من. عەرەبەکە گوتی هیچ کەسێک نی‌یە نەی پێغەمبەری خودا دەخالەت. ئنجا پێغەمبەر سزای نەدا بۆ ڕاکێشانی دڵی کافران بەلکی موسولمان دەبن. پاشان عەرەبەکە وەکو گەڕاوە نێو قەومەکەی خەلکێکی زۆری بەهۆی ئەو موسولمان بوون.

## (غزوة بني مصطلق ومريسيع)
## غەزای بەنی موصطەلەق و مورەیسیع

**١٠١١: عَنْ اَبي سعيدٍ (ض) ماعليكُمْ اَنْ لاتفعَلوا. مامِنْ نَسَمَةٍ كائِنَةٍ الى يَوْمِ القيامَةِ اِلاّ وَهِيَ كائِنَةٌ قالَهُ لَمّا سُئِلَ عَنِ العَزْلِ مِنْ سبيِ بني المصطلقِ.**

### تەرجەمە

١٠١١: (**مُــصْطَلَق**): لەقەبە - واتا نازناوە: بۆ جوزەیمەی کوڕی عەمری کوری ڕەبیعەی کوڕی حارثە. تیرەیەکن لەبەنی خوزاعەی کە بەشێکن لەتیرەی ئەسەد.

بۆیێ خوزاعەیان پێ دەلێن چونکی - تەخەزوعیان کرد واتا پاش کەوتن لەقەومی خۆیان و لەمەککە دانیشتن. بۆیەش جوزەیمە نازناوی نرا بەمصطەلەق - لە -صلقە- بەواتای بەرزکردنی دەنگ وچونکە دەنگی خۆشبووە لەگۆرانی وتن.

غەزای مورەیسیعیشی پێ دەلێن چونکی لە بچووک کردنەوەی (مرسوع)ە. کە بیرێکە لەخوزاعە. بەینی لەگەڵ (فرع) ئەویش شوێنێکە یەک ڕۆژە ڕێیە. لەوێ خەناوکەی حەزرەتی عائشە پسا. وە ئایەتی (تەیەمومیش) هاتە خوارێ. لەمانگی شەعبان لەساڵی شەشەمی کۆچی.

لەم غەزایە دوو وولاغی خۆی پێ بوو یەکی‌یان (لزاز) ئەویتر (ظراب). دەکەسیش لەموهاجیران سواربوون و بیست کەسیش لەئەنصار ئەوانی تر بێ وولاغ بوون. وەکوو بەسەریاندادان هیچ یەکی‌یان قورتار نەبوون. دەکەسیان کوژران حەوت سەد کەسیشیان بە ئەسیر (دیل) هێنا. لەنێو دیلەکان ئافرەت زۆربوو ئێمەش بیست و هەشت شەو بوو لەئافرەتەکانی خۆمان جودا ببوورینەوە. ئنجا بابێینە سەر واتای (حەدیث).

دەگێرنەوە لەئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو بیست و هەشت شەو دەوامان کرد لەغەزای بەنی موصطەلەق. لەنافرەتانیش ئەسری زۆربوو هەوەسی ئافرەتانمان کەوتە جوولە. ویستمان لەگەڵ ئەسیرەکان - عەزل بکەین: مەبەست لەعەزل ئەوەیە لەپێش ئەوەی ئاودکانمان برێژینە ناو ئەندامی مێینەی ئافرەتەکان - ئەندامی نێرینەی خۆمان لەناو دەردەهینا نەوەکوو ببیتە منداڵ یەعنی لەدەرەوە ئاوەکەمان دەرێشت.

وە هەتا بەمنداڵ بوون نرخیان کەم نەبێ.
پاشان گوتمان پێغەمبەر (د) لەنێو ئێمە دایە. با پرسیاری لێ بکەین نەوەک دروست نەبێ ئەم (عەزلە) واتا نەڕێشتنی ئاوی - شەهوەت- لەناو هێنی ئافرەتەکان. ئنجا لێمان پرسی فەرمووی نەکردنی عەزل واجب نی‌یە لەسەر ئێوە - واتا دروستە بیکەن چونکی نی‌یە هیچ نەفسێک کە لە عیلمی خودا تەقدیر کرابێ کە بێتە وجود هەتا ڕۆژی قیامەت هەر پەیدا دەبێ. یەعنی هەرچی داندرابێ و موقەدەر بێ کەببی هەر دەبی ئێوە عەزلیان لەگەڵ بکەن یا نەکەن.

## (غزوة حوديبة)
### غەزای حودەیبە

١٠١٢: عَن عُمَرَ (ض) لَقَد أُنزِلَتْ عليَّ اللَّيْلَةَ سورَةٌ لهِيَ أَحَبُّ اليَّ مِمّا طَلَعَتْ عليهِ الشمسُ ثمَّ قَرَأَ إنّا فتحنا لَكَ فَتحاً مبيناً.

### تەرجەمە

١٠١٢: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عومەر - ڕەزای خودای لێ بی- بەم تەرزە لەسەفەری حودەیبە شەو لەرۆیشتن لەگەڵ پێغەمبەردا بووین (د) دەربارەی شتێک پرسیارێکی لێ کرد. وەلامی نەداوە. جارێکی تریش پرسیارێکی لێ کرد وەلامی نەداوە. جارێکی تریش لێ‌ی پرسی وەلامی نەداوە. چونکی بەوەحی خەریک بوو. بەلام عومەر دووبارە کردنەوەکەی لەبەر ئەمەبوو لای وابوو گوێی لێ نی‌یە. پاشان وەکوو حەزرەتی عومەر هیچ وەلامی نەدراوە. یەکسەر بەخۆی گرت هیە لەدایکت بزربی بۆت بگرێ عومەر - تۆ ئەمە سێ جار بو پرسیارێک دووبارەت کردەوە وەلامی نەدایەوە پێغەمبەر (د) ئەلبەت پرسیارەکەی تۆی پێ خۆش نەبووە. ئنجا حەزرەتی عومەر گوتی منیش ووشترەکەی خۆم زۆر لێ خوڕی کەوتمە پێش لەشکری موسولمانان ترسام کە قورئانم دەرحەق بێتە خوارێ. بۆیێ خۆم ڕانەگرت ڕۆیشتم پاشان ئەمەندەی پێ نەچوو. بیستم یەکێک بانگی من دەکا لەدڵی خۆم گوتم من هەر دەترسام کە قورئان دەربارەی من بێتە خوارێ. هاتم بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی ئیمشەو سوورەتێکم بۆ هاتوتە خوارێ بێ شک ئەم سورەتە لای من خۆشەویست و شیرینترە لەهەرچی خۆری لەسەر هەڵدێ. پاشان خوێندیەوە (إنّا فتحنا لَكَ فَتْحاً مُبيناً) واتا ئێمە تۆمان گێڕا بەسەرکەوتوو لەمەککەو تۆمان غالب کرد لەسەر خەڵکی مەککە. وە لەبەر ئەوەی کە فەتحی مەککە زۆر ڕاست بوو لەهاتنەدی بەشێوەی ڕابردوو ئەداکراوە وە لەم جۆرە باس کردنەش دەلالەت لەسەر گەورەیی ئەوەیە کە خەبەری پێدراوە. چونکی لەکاری بێ نرخ ئەم جۆرە ئەدا کردنە ناکرێ هەروەکوو بزر نی‌یە.

**١٠١٣: عَنْ جـابِرٍ (ض) أنتُمْ خَـيْـرُ أهلِ الأرضِ. قـالَهُ يَوْمَ الحُـدَيْبَـةِ وَكُنّا ألفـاً واربعمائَةٍ.**

### تەرجەمە

١٠١٣: دەگێـڕنـەوە لەجـابری كـوڕی عـبـداللەی ئـەنصـاری ڕەزای خـودایان لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی بەوانەی كە موبایەعەیان كرد لەژێر دارەكە ناسراوە بە (**بیـعـة الرضـوان**). ڕاستەوخۆ فەرمووی ئەی ئەصحابی من ئێوە باشترینی ئەهلی عاردن وە ئێمەش هەزارو چوارسەد كەس بووین. (ش): دارەكەی بەیعەتی لەژێر كرا داری (سومرە) بوو. واتا دارێكی پەلک و ووردو دڕک كورتە لەهەندێ جێ تەعبیردراوە بەداری بنیشت لەهەندێ جێگایانیش بەدار قەزوان. بەیعەتەكەشیان لەسەر مردن بووە. واتا هەڵ نەهاتن لەشەڕ هەتا مردن.

**١٠١٤: عَنْ المِسْـوَرِ (ض) أشـيـروا أيُّهـا النّاسُ عَلَيَّ اتَرَوْنَ أن أمـيلَ الى عـيـالِهِمْ وَذراريِّ هؤلاءِ الذينَ يُريدونَ أنْ يَصـدّونا عَنِ البيت. فـأن يأتونا كـانَ اللّهُ عزَّوَجَلَّ قَدْ قَطَعَ عَـيْناً مِنَ المشركينَ. وَالاّ تركناهمْ مـحـرومينَ. قـال ابوبكرٍ رسـول اللّهِ خَـرَجْتَ عامداً لهذا البيْتِ لاتُريدُ قَتْلَ أحَدٍ ولا حَرْبَ أحَدٍ. فَتَوَجَّهْ لَهُ فَمَنْ صَدّنا عَنْهُ قـاتَلْناهُ قالَ امضوا على اسمِ اللّهِ.**

### تەرجەمە

١٠١٤: دەگێڕنەوە لەمـسـوەری كـوڕی مـەخـرەمە ڕەزای خـودای لێ بی. گـوتی وەكـوو پێغەمبەر (د) تەشریفی لەمەدینە هاتە دەرێ بۆ مەككە لەجێگایەک كە پێ‌ی دەڵێن (**ذو الحُلیـفـة**) نی‌یەتی بەعومرە هێناو كەوتە ئیحرام. بسوری كوڕی سفیانی خوزاعی بەجاسوسی بۆلای قـوڕەیش ڕەوانە كـرد. بەئەصـحـابەوە تەشـریفی فـەرمـوو هەتـا (غـدیر الأشطاط) جێگایەكە بەرامبەر مەدینە جاسوس (شۆڤار) هاتەوە گوتی بەڕاستی قوڕەیش لەشكرێكی زۆریان لەتیرەو هۆزەكانی پەراگەندەی عەرەب كۆكردووتەوە بۆ شەڕكردن لەگەڵ تۆ. هیچ گـومـانی تیـا نی‌یە كوشـتـارت لەگەڵ دەكەن. وە ناهێڵن بچی‌یە بەیت و مـەككە ئنجا پێغەمبەر (د) بۆ پرس و ڕاكردن ڕووی لەئەصحاب كرد. فەرمووی ئەرێ ئێوە بەچاكی دەزانن واتـا خـەبەرم پێ بدەن من مـەیل بكەم بۆلای مـاڵ و منـاڵ و خـێـزانی ئەوانەی دەیانەوێ ئێمە قەدەغە بكەن لەزیارەتی (بەیت) ئەگەر شەڕیان لەگەڵ كردین.

وە ئەگەر شەریشیان لەگەڵ ئێمە پێ نەکراو ژێرکەوتن ڕووت و بێ بەشیان بکەین لەماڵ و منداڵ و خێزانیان. (لەم فەرموودەی پێغەمبەر جۆشی تووڕەیی هەست پێ دەکرێ بۆیێ حەزرەتی ئەبو بەکر بەقسەیەکی سەربەستانە کەوتە وەلام). گوتی ئەی پێغەمبەری خودا تۆ بۆ مەبەستی ئەم بەیتە هاتوویە دەرێ ناتەوێ کەسێک بکوژی. وە ناتەوێ شەڕ لەگەڵ کەسدا بکەی. ئنجا فەرموو ڕووت لەبەیت بکە پاشان ئەگەر کەسێک ڕێمان لێ بگرێ کوشتاری لەگەڵ دەکەین. پێغەمبەر (د) فەرمووی بەداواکردنی یاریدە لەنێوی خودای گەورە بڕۆن بەرەو مەککە.

## (غزوة خيبر)
## شەڕی خەیبەر

١٠١٥: عَنْ سلَمةَ بْنِ الأكوَع (ض) مَنْ هذا السّائقُ قالوا عامِرُ ابْنُ الأكوَع. قالَ يَرْحمهُ اللّهُ. ماهذِهِ النيرانُ. على اَي شَيْئٍ توقِدونَ. قالوا على لَحْمٍ. قالَ على أيِّ لَحْمٍ. قالوا لَحْمُ حمُر الأنسيَّةِ قالَ اَهْرِيقوها واُكسِروها. فقالَ رَجُلٌ اَو نُهْرِيقُها ونَغسِلُها. قالَ اَوْذاكَ. مالَكَ. قُلْتُ لَهُ فِداكَ اَبي وَأُمّي. زَعَموا اَنْ حَبِطَ عَمَلُهُ قالَ كَذَبَ مَنْ قالَهُ اِنَّ لَهُ لاجْرَيْنِ وَجَمَعَ بيْنَ اصبعيهِ اِنَّهُ لجاهِدٌ مجاهِدٌ قَلَّ عربيٌّ مشي بها مِثْلُهُ. وفي رِوايَةٍ نَشَأَ بِها.

### تەرجەمە

١٠١٥: دەگێڕنەوە لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ڕەزای خودای لێ بی. گوتی شەو بوو وەکوو بۆسەر خەیبەر چووین لەخدمەت پێغەمبەر (د) ئوسەیدی کوڕی حوضەر بەعامری کوڕی ئەکوەعی گوت بۆ چ شتێکمان ناخەیە گوێ لەڕەجەزو شیعرەکانت. عامریش لەووشتر دابەزی شاعیرێکی باش بوو گوتی:

اَللّهُمَّ لولا انتَ ما اهتَدَيْنا * ولا تَصدَّقنا ولاصلَّينا
فاغفِرْ فِداءً لَكَ ما اَبقينا * وَالقَيْنَ سكينَةً عَلَيْنا
وَثَبِّت الأقدامَ اِنْ لاقينا * اِنّا اِذا صيحَ بنا اَبَيْنا

واتاکەی: ئەی خودایا گەر تۆ نەبوای (مەبەستی محمدە (د)) نەدەهاتینە سەر ڕێگای ڕاست. وە خێریشمان نەدەکردو نوێژیشمان نەدەکرد. بەفیدا بۆتۆ ئەی محمد وە بە حورمەتی تۆ وە صەبرو ئارامی تۆ صەبرو ئارامیش بخە ناو دڵ و ڕامان بگرە وەکوو تووشی دوژمن بووین وەکوو دەعوەت بکرێین بۆ ناحەق ئێمە نای کەین وە لەکاتی بەیانیش.

بەدەنگی بلند قەصدیٰ ئێمەیان کرد ڕوو لەسەر زیانی ئێمە یاریدەیان خواست لەدوژمنانی ئێمە.

پاشان پێغەمبەر فەرمووی کێیە ئەم هاژوەرەی ووشتارەکانمان گوتیان عامری کوری ئەکوەعە فەرمووی ڕەحمەتی خودای لێ بی یاخۆ فەرمووی خوا لێت خۆشبوو. حەزرەتی عومەر فەرمووی بۆ عامر شەهید بوون واجب بوو (چونکی ئیمامی ئەحمەد گوتیتی هەرکەسی پێغەمبەر (د) دوعای لێ بوزدنی بۆ کردبێ گەیشتوەتە پلەی شەهیدبوون واتا/ شەهید بووە. ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی وات نەکرد کەلک لەعومری درێژی عامر وەرگرین.

ئنجا هاتینە سەر خەیبەر. دەوەرەمان لێ دا. هەتا برسی بوونێکی زۆری سەختمان توش بوو. پاشان خودای گەورە. یەکە قەڵاتەکانی بۆ فەتح کردین. یەکەم قەڵات کە بۆمان کراوە قەڵاتی (ناعم) بوو. وەکوو فەتحیان کرد. ئێوارە ئاگرێکی زۆریان کردەوە. پێغەمبەر (د) فەرمووی چی‌یە ئەم هەموو ئاگرانە لەسەر چیان کردووتەوە گوتیان لەسەر گۆشت دا دەگێرسێنن. فەرمووی لەسەر چی گۆشتێک. گوتیان گۆشتی ئەو کەرە مالیانەیە کە بۆ بارهەلگرتن بەکاریان دەینین. پێغەمبەر (د) فەرمووی گۆشتەکان برێژن. مەنجەلەکانیش بشکێنن حەزرەتی عومەر فەرمووی باشە گۆشتەکان دەڕێژین بەلام بۆچی مەنجەلەکان بشکێنین. دەیان شۆین فەرمووی باشە یاخۆ بیان شۆن. ئنجا وەکوو بۆ کوشتار لەشکر ڕێزی بەست. شیرەکەی عامری کوری ئەکوەع کورت بوو بۆ جوولەکەیەکی ڕاوەشاند کە لەقاچی بدا. دەمی شیرەکەی بۆلای خۆی گەڕایەوە بەعەینی ئەژنۆی خۆی کەوت بەمە وەفاتی کرد. (ئنجا سەلەمە کە ئەم حەدیثەی لێ دەگێڕنەوە گوتی ئەصحاب لەنێو خۆیان گوتیان عامر نەگەیشتە پلەی شەهیدبوون بەلکی خۆی کوشت چونکی بەشیری خۆی خۆی کوشت. منیش لەم قسەی ئەصحاب زۆر غەمناک بووم. بەگریان هاتمە خدمەت پێغەمبەر (د) وەکوو چاوی پیرۆزی بەمن کەوت. دەستی گرتم فەرمووی چیتە بۆ غەمناکی. منیش گوتم باوکو دایکم بەقوربانت بی ئەصحاب لەنێو خۆیان دەلێن عامر شەهید نەبووە وە هەموو خێرو چاکەشی بەفیرۆ چوو چونکی خۆی کوشت پێغەمبەر (د) فەرمووی: درۆی

کردووه ئەوی ئەم قسەی کردووە. لەگەڵ ئاماژەکردن بەدوو ئەنگوستی فەرمووی: بەڕاستی عامر. پاداشت و خێری دوو چەندانەی هەیەو بەبێ گومان. عامر لەڕێگای خودا تووشی هەوڵ و ماندووبوون بوو موجاهیدیش بوو کەمە پیاوێک عەرەب بێ وەکو ئەو لەم عاردانە ڕۆیشتبی (واتا: وێنەو ئەمثالی عامر کەم بوو).

**١٠١٦: عَنْ أَبي موسى (ض) اِرْبعوا على انفسكم اِنكُمْ لاتدعونَ. اَصمَّ وَلا غائباً. اِنكم تدعونَ سميعاً قريباً وَهوَ معكُمْ. ياعبدَاللّهِ ابْنَ قيسٍ اَلا ادلُّكَ على كلِمَةٌ مِنْ كنزٍ من كنوزِ الجنَّةِ لاحَوْلَ ولا قوَّةَ اِلاَّ باللّهِ.**

### تەرجەمە

١٠١٦: دەگێڕنەوە لەئەبو موسی‌ی ئەشعەری عبداللەی کوری قەیسی ئەشعەری ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو پێغەمبەر غەزای خەیبەری کرد بەلەشکرەوە وەکوو بەسەر جێگایێکی بەرز بکەوتنایە بەدەنگێکی بەرز. ئەوانی لەخدمەتی دابوو دەیانگوت الله اکبر -الله اکبر لا اله الا الله. پێغەمبەر (د) فەرمووی مەرحەمەت بەخۆتان بکەن. بەدەنگی بەرز یادی خودا مەکەن. خۆتان قەددغە بکەن لەدەنگ بلندکردن بۆ یادی خودا. چونکی ئێوە لەیەکێکی وا ناپاڕێنەوە کەڕبی و گوێی لەهیچ نەبی. وە بانگی یەکێکی وا ناکەن لێرە ئامادە نەبێ. بەڕاستی ئێوە بانگی یەکێک دەکەن نزیکە لێتان دەبیێ هەموو قسەی بەدزی و بەناشکراتان. ئاگادارە بەهەموو ئەسرار (نهینی) و بزرتر لەئەسرار. وە ئەم زاتەی کە ئێوە بانگی دەکەن بەذات و صفاتی خۆی لەگەڵ ئێوە دایە. منیش لەپاش پێغەمبەر دەرۆیشتم کە بەسواری لەپێشم دەڕۆیشت. دەم گوت **(لاحول ولا قوةَ اِلاّ بالله)** ڕاستەوخۆ پێ‌ی گوتم ئەی عبدالله کوری قەیس گوتم (لبیک) واتە لەخدمەت ڕاوەستاوم ئەی پێغەمبەری خودا. ئاگاداربە کلمەیێکت پێدەلێم کە گەنجێکە لەگەنجەکانی بەهەشت گوتم فەرموو پێم بلێ ئەی پێغەمبەری خودا دایک و باوکم بەقوربانت بێ فەرمووی **(لاحول ولا قوَّةَ اِلاّ بالله)** یەعنی هیچ ڕوو وەرگێران و ڕوو سووڕاندن نی‌یە لەگوناە. وە هێزو تاقەتیش لەسەر خودا پەرستی نی‌یە بەخودا نەبێ.

(عەینی) ئەم حەدیثە ڕەت بوو لەباسی کارەکانی ناپەسند (مکروهات) دەنگ بەرزکردن بەگوتنی ووشەی -الله اکبر-.

١٠١٧: عَن سَهْلٍ (ض) اَما اِنَّهُ مِنْ اَهلِ النّار. قالَهُ في رَجُلٍ قَتَلَ نفسَهُ. فقالَ رَجُلٌ أشهَدُ اَنَّكَ رسول الله فقالَ وَماذاكَ. فأخبَرَهُ. فقَالَ اِنَّ الرَّجُلَ ليعملُ عَمَلَ اَهلِ الجنَّةِ فيما يبدو لِلنّاس وَهوَ مِن اَهلِ النّار وَاِنَّ الرَّجُلَ يَعمَلُ عَمَلَ اهل النّار فيما يبدو! للناس وَهوَ مِن اَهلَ الجنَّةِ. وَ في روايَةٍ. قُمْ يافلانُ فأذِّنْ اَنَّهُ لايَدْخُلُ الجَنَّةَ اِلاّ مؤمِنٌ اِنَّ اللَّهَ يُؤيِّدُ الدّينَ بالرَّجُلِ الفاجِرِ.

## تەرجەمە

١٠١٧: دەگێڕنەوە لەسەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ڕەزای خودای لێ بی. گوتی بەڕاستی لەغەزای خەیبەر پێغەمبەر (د) لەگەڵ کافران توشی یەکتری هاتن بووە کوشتار. پاشان وەکوو لەدوایی کوشتاری ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (د) گەڕاوە. ئەهلی خەیبەریش کشانەوە نێو عەسکەری خۆیان. تەماشاشیان کرد لەنێو عەسکەری ئیسلام پیاوێک هەیە بەقەطعی یەکێک لە جوولەکە چی لەگەڵ جەماعەت بێ چی بەتەنیا بوبێ قورتار ناک مەگەر بەشیری خۆی ئەکەوتە شوێنی ئەیدا بەرشیران (پیاوەکەیش قوزمانی بەنی ظوفری ئەنصاری بوو- کە نازناوی (ابو الغیراق بوو). ئنجا ئازایی و قارەمانیەتی قوزمانیان بەپێغەمبەر گوت. فەرمووی ئاگاداربن ئەمە لەبەر منافقی نێو دەروونی ئەهلی ئاگرە. ئەکتەمی کوڕی ابو الجونی خوزاعی گوتی من یەقەی قوزمان بەرنادەم. بزانم ئاخری کاری چی بەسەر دێ. ئنجا کەوتە شوێنی. ئەگەر قوزمان بڕۆیشتایە ئەکتەمیش ئەڕۆیشت. ئەگەر ڕابوەستایە ئەویش ڕادەوەستا. ئەگەر چوستی بکردایە لەڕۆشتن ئەویش چوستی دەکرد. هەتا کاتێک قوزمان بە زامێکی سەخت زامدار کرا. لەمردنی خۆی پەلەی کرد نووکی شیری لەبەینی دوو مەکی خۆی دانا بەڕاوەستاوی خۆی کوشت. ئەکتەم وەکوو ئەمەی لێ دیت چووە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی (أشهد انک رسول الله) پێغەمبەر (د) فەرمووی چی قەوماوە لەم کاتە ئەم شاهدیە دەدەی ئەکتەم حیکایەتی قزمانی بۆ گێڕایەوە لەسەر فەرموودەی تۆ خۆی کوشت بوو بە ئەهلی ئاگر. چونکی عالەم ئەم قسەیان لا گەورە بوو لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵ و تێ کۆشانەی لەجیهاد ئەهلی ئاگر بی. منیش یەقەم بەرنەدا هەتا ئەم حالەم لێ دیت قسەی پێغەمبەر (د) هاتە جێ.

پێغەمبەر فەرمووی پیاو هەیە کاری ئەهلی بەهەشت دەکا لەپێش چاوی خەلک کەچی ئەهلی ئاگریشە. پیاویش هەیە کاری ئەهلی ئاگر دەکا کەچی ئەهلی بەهەشتیشە. لەگیرانەوەیەکی تریش پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی فلان (واتا ئەی بلال لای بخاری یان ئەی عومەر لای موسلم یان ئەی عبدالرحمن کوڕی عەوف) هەلستە بانگ بدە لێت

ـسوگەربی ناچیتە بەهەشت ئەگەر ئیماندار نەبی. بەبێ گومان خودا ئەم دینی ئیسلامە بەهێز دەخا بەپیاوی بێ دین و کافر بەشێوەیەک لەشێوەکان. ئەم حیکایەتەی خۆ کوشتنی قوزمان ئەگەرچی لای هەندەکانیش لەغەزای نوحود بووە بەڵام ڕاستیەکەی لای (نەجاریە) کە لەغەزای خەیبەر بووە. (ش): لەم گێڕانەوەی پاشوو هەلبەست هەیە کە قوزمان بێ ئیمان چوو.

**١٠١٨: عَنْ اَسماءِ بنْتِ عُمَيسٍ (ض) قال صلى الله عليه وسلم فما قُلْتِ لَهُ قالَتْ قُلْتُ كذا وَكذا. قالَ لَيْسَ بأحَقَّ بي منكم وَلَهُ ولأصحابِهِ هِجْرَةٌ واحِدَة وَلَكُمْ انتم اَهلَ السفينَةِ هِجرَتانِ قالهُ حينَ قالَتْ يا نبيَّ اللّهِ اِنَّ عُمَرَ قالَ نحنُ اَحَقُّ برسول اللّهِ منكم.**

**تەرجەمە**

١٠١٨: دەگێڕنەوە لە ئەبو موسی عبداللە کوڕی قەیسی ئەشعەری ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو زانیمان پێغەمبەر (د) کۆچی کردووە بۆ مەدینە. ئێمەش لەیەمەن بووین. بۆلای پێغەمبەر (د) دەرچووین بەموهاجیر من و دووبرای لەخۆم گەورەتر (ئەبو بوردەو ئەبو رهم) لەگەڵ پەنجاوسێ کەسی لەئەشعەری قەومی خۆمان سواری کەشتی بووین ئێمەی گەیاندە لای نەجاشی لەحەبەشە لەوێ لەگەڵ جەعفەری کوڕی ئەبو طالب ڕێک کەوتین. دانیشتین هەتا هەموومان بەیەکەوە هاتینەوە. ئەوانیش بەژن و پیاو شازدە کەس بوون یەک لەوان ژنی خۆی ئەسمائە کچی عومەیس بوو وا ڕێک کەوت لەکاتی داگیرکردنی خەیبەر بەخدمەت پێغەمبەر گەیشتین. پێغەمبەریش (د) لەتالانی بەشی هیچ کەسێکی نەدا کە ئامادەی جیهادی خەیبەر نەبوون بەڵام بۆ ئێمە کە موهاجیرەکانی حەبەشە بووین. پرسی کرد بە شەڕکەرەکانی خەیبەر کە بمان کەن بەشریک لەتالانی خەیبەر موسلمانیش ئەوانیان بەشدار کرد. هەندێک لە خەلکان ئیمامی عومەریش لەوان بوو. گوتیان ئێمە لەوانە لەپێش ترین لەهیجرەت کە لەناو سەفینە (کەشتی) بوون. ئەسمائە کچی عومەیس کە لەگەڵ مێردی خۆی لەگەڵ ئێمە لەکەشتی دا بوون بەزیارەت بۆلای دایکی ئیمانداران حەفصەی کچی حەزرەتی عومەر چوو. حەزرەتی عومەریش هاتە لای حەفصەی کچی ئەسمائەش لای بوو. حەزرەتی عومەر چاوی بە ئەسمائە کەوت گوتی ئەمە کێیە؟. حەفصە گوتی ئەسمائەی کچی عومەیسە. حەزرەتی عومەر فەرمووی ئەسمائەی حەبەشیە ئەمەیە. ئەسمائەی بەحریە ئەمەیە. ئەسمائە فەرمووی (بەلێ). حەزرەتی عومەر گوتی ئێمە بەهیجرەت لەئێوە لەپێش ترین. ئێمە لێ وەشاوەترین بۆ پێغەمبەر لەئێوە. ئەسمائە

ڕقی بۆوە گوتی نا وانی‌یە والله من لەخدمەت پێغەمبەر بووم کە برسیەکانی ئێوەی نان دەدا. نەزانەکانی ئێوەی ئامۆژگاری دەکرد. ئێمەش لەوولاتی غەریباتی لەعەردێکی ناخۆشبووین. مەبەستیشمان هەر خوداو ڕازی بوونی خوداو پێغەمبەری خودا بوو (د). سوێند بەخوا هیچ ناخۆم هیچ ناخۆمەوە هەتا ئەم قسەی تۆ بە پێغەمبەر نەلێم. ئێمە ترساندراوین ئەزیەت دراوین لەڕێگای ئەم ئایینە ئنجا ئەچم ئەم قسە بەپێغەمبەر دەلێم وە پرسیار لەو دەکەم. والله درۆناکەم. لانادەم زیادیش بەسەر وەنانێم ئنجا وەکوو هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا عومەر وای گوت وای گوت. پێغەمبەریش (د) فەرمووی تۆ چیت بەئەو گوت. گوتم واو وا (یەعنی هەدوو قسەکانی لەبەینیان کرابوو بۆی گێڕایەوە). پێغەمبەر (د) فەرمووی وانی‌یە عومەر دەرحەق بەمن لێ وەشاوەتر بێ لەئێوە. بۆ عومەرو هەوالەکانی یەک هیجرەت ثابت بوو بۆ ئێوە ئەهلی کەشتی دوو هیجرەت (کۆچ کردن) هەیە. هیجرەتێکتان بۆ حەبەشە هیجرەتێکیشتان بۆ لای من.

(ش): ئەسمائە گوتی چاوم بەئەبو موسی‌ی ئەشعەری و ئەهلی کەشتی کەوت پۆل پۆل دەهاتنە لام بۆ بیستنی ئەم قسە خۆشەی پێغەمبەر (د) هیچ شتێک لەدونیا لەم قسەیە بۆ ئەوان خۆشتر نەبوو کە مایەی کەیف خۆش بوون بوو.

**١٠١٩: عَن اَبي موسى (ض) إنّي لأعِرفُ أَصواتَ رفقة الأشعرينَ بالقرآنِ حين يدخلونَ باللّيْلِ وَاَعرفُ منازلَهُمْ مِن أصواتِهِمْ بالقرآنِ. باللَّيْلِ وَاِن كنتُ لَمْ أرَ منازِلَهُمْ حينَ نَزَلوا بالنهارِ ومِنهم حكيمٌ اِذا لقي الخيْلَ - أو قالَ العدوُّ. قالَ لَهُمْ اِنَّ اصحابي يأمرونَكُمْ ان تنظروهُمْ.**

### تەرجەمە

١٠١٩: دەگێڕنەوە لەئەبو موسی‌ی ئەشعەرەی ڕەزای خودای لێ‌بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بێ گومان من دەناسم دەنگی هەوالەکانی ئەشعەری بەخوێندنی قورئان لەشەودا. وە بەئاوازی خوێندنەوەی قورئانیشیان بەشەو قۆناخ و جێگایان دەناسم ئەگەرچی بەڕۆژیش نەمدیون وەکوو دابەزیون لەچی جێگایێکن. وە لەوانیشدا هەیە هوشمەندو مەردازای وا وەکوو تووشی لەشکری دوژمن بێ پێ‌یان دەلێ بەڕاستی ڕەفیقەکانی من فەرمانتان پێ دەکەن کە چاودڕێ‌یان بکەن. (واتا ئەی لەشکری دوژمن ئەگەر ئێوە فکرتان وایە لەپێش تاقە سوارێکی وەکوو من ڕابکەن ئەرێ چی ئەکەن لەبەرامبەر هەوالەکانم کە

هێشتا نەهاتوونە بەڵام بەزمانی ئەوەی کە هەوەسیان بەکوشتاری ئێوە دێ پێتان دەڵێن چاوەڕێمان بکەن ئەی کافرینە هەتا پێتان دەگەین) لەبڕگەی دوایی زۆر مەعنا لێ دراوەتەوە لەلایەن ئەوانەی شەرحی حەدیثیان کردووە. بەڵام ئەو مەعنای نووسەری ئەم دێرانە ئەوە بوو کە نووسرا لەمەعنای ئەم حەدیثە. ئارەزووشت هەیە تەماشای شەرقاوی بکە.

## غەزای مؤتە

**١٠٢٠: عَنْ ابنِ عمر (ض) اِن قُتِلَ زَيْدٌ فجَعْفَرُ واِن قُتِلَ جَعْفَرُ فعبدالله ابنُ رواحة.**

### تەرجەمە

١٠٢٠: لەبەر ئەوەی تەرجەمەی ئەم حەدیثە لەباسی (جەنازە) ڕەت بوو بەدرێژە پێدانێکی زۆرباش لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

**١٠٢١: عَنْ أُسامَةَ (ض) يا أُسامَةُ اَقَتَلْتَهُ بعدَما قالَ لا الهَ الاَّ اللّهُ قلتُ كانَ متعوّذاً. فمازالَ يكرّرها حتّى تمنيْتُ اِنّي لَمْ اَكُنْ اَسْلَمْتُ قبلَ ذلِكَ اليَوْمِ.**

### تەرجەمە

١٠٢١: دەگێڕنەوە لەئوسامەی کوری زەیدی کوری حارثە رەزای خوای لێ بێ گوتی پێغەمبەر (د) ئێمەی نارد بۆ سەر تیرەی (حرقە) لەگەڵ بەیانی گەیشتینە سەریان قەومەکە ڕایان کرد. من و پیاوێکی ئەنصاری گەیشتینە پیاوێکی‌یان وەکوو بەسەر سوڕمایی و بێ هوشی فڕەماندا گوتی لا اله الا الله. پیاوەکەی ئەنصاری وازی لێ هێنا منیش دامە بەر بەردان هەتا کوشتم. وەکوو هاتینەوە ئەم خەبەرە گەیشتە پێغەمبەر (د) ئنجا فەرمووی ئەی ئوسامە کوشتت لەپاش ئەوەی گوتی لا اله الا الله. منیش گوتم: بۆ خاتری ئەوەی وای گوت هەتا خۆی لەکوشتن ڕزگار بکا. پاشان پێغەمبەر (د) ئەمەندەی دووبارە کردەوە ئەم فەرموودەیە هەتا لەئەنجام گوتی کاشکی من هەتا ئیمرۆ موسولمان نەبوومایە.

(ش): ئەم قسەیە لەلایەن ئوسامە لەسەر حەقیقەت نەبووە بەڵکی لەبەر (زێدە ڕۆیی -مبالغە). وای گوت.

## (غزوة الفتح)
## شەڕی کردنەوەی مەککە

•

**١٠٢٢: عَنْ ابْنِ عباس (ض) اِحبِسْ اَباسفيانَ عنْدَ حَطْمِ الخيْلِ حتّى ينظُرَ الى المسلمينَ. فلَمّا مَرَّ رسول اللّهِ صلى الله تعالى عليه وسلم. بأَبي سفيانَ قالَ اَلَمْ تعلَمْ ماقالَ سعْدُ ابنُ عبادةَ. قالَ ماقالَ. قالَ قالَ كذا وكذا. فقالَ كذبَ سَعْدٌ ولكِنْ هذا يَوْمٌ يُعَظِّمُ اللّهُ فيهِ الكعْبَةَ وَيَوْمٌ تُكسى فيهِ الكعْبَةُ.**

«لەبەر ئەوەی پەیمانی حودەیبیە لەلایەن کافرەکانی مەککە جێ بەجێ نەکرا مەککە لەلایەن موسولمانەکان (فەتح) کرا لەساڵی هەشتەمی کۆچی».

### تەرجەمە

١٠٢٢: دەگێڕنەوە لەعبداللە کوڕی حەزرەتی عەباس ڕەزای خودایان لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) لەدووی مانگی ڕەمەزان. بەدەهەزارەوە لەمەدینە چووە دەرێ بۆ فەتحی مەککە. پێغەمبەر (د) بەرۆژوو بوو موسولمانیش هەموو بەرۆژوو بوون. هەتا گەیشتە (ئاوێک) پێ یدەلێن (کەدیە) کە دەکەوێتە بەینی (عوسفان و قودەید) پاش عەسر بوو پێغەمبەر (د) ڕۆژووی شکاند موسولمانیش ڕۆژوویان شکاند (ش) ئەمە ناسخە بۆ هەموو **(فمَن شهِدَ منكم الشهرَ فليَصُمْهُ)** ئەم ئایەتە وادەگری کە ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات دەبێ موسولمانان بەرۆژووبن بەڵام تەخصیص دەکا بەغەیری سەفەر/ واتا ئەگەر لەسەفەردا نەبن. بەڵام کاتی سەفەر دروستە بیشکێنن.

دەگێڕنەوە لەعروەی کوڕی زوبەیر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی ساڵی فەتح وەکوو پێغەمبەر(د) تەشریفی بۆ سەر مەککە چوو قورەیش خەبەریان زانی. ئەبو سوفیان و حەکیمی کوری حەززام وە بودەیلی کوڕی وەرقاء بۆ زانینی هەوالی لەشکری ئیسلام هاتنە دەرێ. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە (مر الظهران). جێگایێکی نزیکە لەمەککە ئێستا وادی فاطمەی پێ دەلێن لەناکاو چاویان بەئاگرێکی زۆر کەوت. ئەبو سوفیان گوتی.ئەم هەموو ئاگرە زۆرە چی یە؟ گۆیا ئاگری شەوی عەرەفەیە. بودەیل گوتی ئاگری بەنی عەمرە یەعنی خوزاعەیە. ئەبو سفیان گوتی ئاگری بەنی عەمر لەمە کەمترە. هەندێ لە حەرەسی پێغەمبەر(د) چاویان پێیان کەوت. قورتار نەبوون. گیران هەر سێیان هینان بۆ خدمەت پێغەمبەر(د) ئەبو سوفیان موسولمان بوو ڕەزای خودای لێ بی ئنجا وەکوو ڕۆیشت

فەرمانی بە عەباسی مامی کرد کە ئەبو سوفیان لە (حطم الخیل) ڕابگرە. هەتا چاوی بەلەشکری ئیسلام بکەوی (چونکی حطم الخیل لووتە کێوێکە وەکوو دەربەند ڕەت بوون بەویندەرێدا ناچاری‌یە) عەباسیش بردی لەوێ ڕای گرت تیرەکانی ئیسلامیش یێکە یێکە هاتن بەپیشیدا ڕەت بوون تیپە سوارێکی بەپێشدا ڕەت بوو. گوتی ئەی عەباس ئەم سوارانە کێن. گوتی عەشیرەتی غفارن. ئەبو سوفیان گوتی من لەکوێ غفار لەکوێ (یەعنی ئێمەی قورەیش لەگەڵ غفار نەبە دوژمنایەتی نەبە دۆستایەتی موناسەبەمان نی‌یە) پاشان تیرەی جوهەینە ڕەت بوو لەوانیش پرسی لەعەباس وەکوو قسەی پێشوو گوتی من لەکوێ و جوهەینە لەکوێ پاشان لەشکری سعدی کوڕی هوذەیم ڕەت بوو لەویشی پرسی و هەر قسەی پێشووشی کرد. لەپاشان تیرەی سولەیم ڕەت بوو لەویشی پرسی و هەرواشی گوت هەتا تیپە عەسکەرێکی زۆر گەورە هات ئەبو سوفیان گوتی ئەمانە چە تیرەیەکن عەباس گوتی ئەمانە ئەنصارن لەژێر بەیداغی سەعدی کوری عوبادە ئەو سەرۆکی یانە سەعد گوتی ئەی ئەبو سوفیان ئیمرۆ ڕۆژی (مەلحەمەیە) یەعنی ڕۆژی کوشتن و کوشتارە. ئیمرۆ استحلالی کەعبە دەکرێ پەردەی حەرەمیەتی دەدرێ. ئەبو سوفیان گوتی ئەی عەباس (حَبذا یَوْمَ الذمار). یەعنی ئیمرۆکە ئێوە بەفکری کوشتن و کوشتار بچنە سەر مەکە ڕۆژێکی خۆشەویستە بۆ خەڵکی مەککە چونکی هەرکەسێک بەبیری کوشتار چوبیتە سەر مەککە تۆڵە کردنەوە هەر بۆ خەڵکی مەککە بووە. دوژمنی خەڵکی مەککە هەر ژێرکەوتووبووە. پاشان تیپێکی تر هاتن لەوانی پێشوو کەمتر بوو پێغەمبەریان لەگەڵ دابوو. بەیداغی پێغەمبەر (د) بەدەست زوبەیری کوڕی عەوام بوو وەکوو پێغەمبەر (د) بەلای ئەبو سوفیان ڕەت بوو پێ‌ی گوت ئەی پێغەمبەری خودا نەتزانی سەعدی کوڕی عوبادە چی گوت. فەرموی چی گوت. گوتی سەعد گوتی ئیمرۆ ڕۆژی مەلحەمەو کوشتاری گەورەیە. پێغەمبەر (د) فەرمووی سەعد درۆی کردووە. بەلکی ئیمرۆ ڕۆژێکە کە خودا تەعظیمی کەعبەی لێ دەکا وە ڕۆژێکە کەعبەی لێ بەرگ دەکرێ. بەهۆی بەدیارکەوتنی ئیسلام وە بانگ دانی بلال لەسەر کەعبە وەلابردنی بت و سەنەم و وێنەو صورەت لەنێو بەیت و شتی تریش پێغەمبەر (د) فەرمانی دا کە بەیداغی خۆی لە (حەجون) بچەقێ حەجون جێگاییێکە لەنزیک قەبرستانی مەککە. عەباس بەزوبەیری گوت ئەی باوکی عبدالله لێرە پێغەمبەر (د) ئەمری بەتۆ فەرمووە بەیداغت بچەقێنی. پێغەمبەر (د) ئەو ڕۆژە فەرمانی بەخالد کوڕی وەلید کرد کە لە سەرەوەی مەککە لەکەدا‌ء ەوە بۆ مەککە بێ. پێغەمبەریش (د) لە (کُدای) کە لە خوارووی مەککەیە. پاشان هەندێ لەقورەیش وەکو سوهەیلی کوڕی عەمر وە صەفوانی کوری ئومیە لە (خندمە) کە

جێگایێکه لەخوارەوەی مەککە. بۆ کوشتار کۆبوونەوە خالد تووشیان هات کوشتاری کورت رووی دا بەم تەرزە لەهەوالانی خالد دووکەس کوژرا یەکیان خالدی کوڕی سەعدی خوزاعی بوو کە نازناوی (حوبەیش) بوو. دووەم کورزی کوڕی جابری فهری بوو لەکافرانیش دوازدە یان سێزدە کەس کوژرا.

(ش): ئەم قسەی کوشتاری خالد کە لە (خندمە) بوو. ئەوە بەڕاست دەسەلمێنێ کە لەچەند حەدیثێکی ڕاست هاتووە کە خالد لەخوارەوەی مەککە بووە. پێغەمبەریش (د) لەسەرەوەی مەککە بوە وەکوو چوونە ناو مەککە.

**١٠٢٣: عَن عبدالله (ض) جاءَ الحقُّ وَزَهقَ الباطِلُ جاءَ الحقُّ وَما يُبديُ الباطِلُ وَما يعيدُ.**

### تەرجەمە

١٠٢٣: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) ڕۆژی گرتنی مەککە چووە ناو مەککە لەدەوردی بەیت سێ سەدو شەست بوت هەبوو. دارێکی باریکی بەدەستەوەبوو یەکە یەکە دارێکی دەگەیاندێ و دەی فەرموو (جاء الحق...) واتە ڕاستی و حەق هات... هتد. بوتەکان سەرنگون دەبوون. مەعنای فەرموودەکەشی حەق کە ئیسلامەو قورئان هات. وە کفریش نەما حەق هات (باطلیش) کەشتی پووچەلە نەبووەو مەعدوومە نەهیچ ئیجاد دەکا لەعەدەمەوە نە هیچ شتێکیش کە نەبێ لەپاش وجود دەگێڕیتەوە بۆ وجود.

**١٠٢٤: عَنْ عَمرو ابْنِ سلَمةَ (ض) صلّوا صَلاةً كذا في حين كذا وَصلّوا كذا في حين كذا. فاذا حَضرَتِ الصَّلاةُ فليؤذّنْ اَحدُكُمْ. وليؤُمّكُمْ اكثرُكُم قرآناً.**

### تەرجەمە

١٠٢٤: دەگێڕنەوە لەعەمری کوری سلیمە کوڕی قەیس. گوتی مالی ئێمە لەسەر ئاوێک دابەزیبووین. شوێنی هاتوچۆی خەلک بوو. ڕێبوار زۆر لەلامان دادەبەزین. ئێمەیش پرسیارمان لێ دەکردن ئەم پیاوە چیە پەیدا بووە دەیانگوت ئەم پیاوە دەلێ خوا ئەوی ناردووە وە وەحی بۆ دەنێرێ. بۆ ئێمەیشیان دەخوێندەوە منیش منال بووم لەم ڕێبوارانە قورئانم زۆر لەبەر کردبوو. عەرەبیش بۆ موسولمان بوونیان چاوەڕێی فەتحی

ـەککەیان دەکـرد. دەیان گـوت وازی لێ بینن لەگـەڵ قـەوْمـەکـەی خۆی. چونکی ئەگـەر ـەرکەوت بەسـەر خەڵکی مەککە دیارە پێغەمبەرێکی ڕاستە. ئینجا وەکوو مەککە فەتح کرا. هەموو تیـرەو هۆزێک تالووکەیان کرد بۆ موسولمان بوون. (سلیمەی) باوکیشم لەپێش هۆزەکەمـان پەلەی کرد بۆ مـوسـولمان بوون لەپاش گەورەبوون بەئاینی ئیـسـلام هاتەوە (واتە مـوسـولمان بـوو) گـوتی واللە لەخـدمـەت پێـغـەمـبـەر (د) هاتوومـەوە لاتان. بەڕاسـتـی پێغەمبەری خودایە. ئەوا ڕێگا بەخەلک نیشان دەدا. دەفەرموێ فلان نوێژ بکەن لەفلان کات. وە نوێژێکی وابکەن لەوەقتێکی وا. وەکو کاتی نوێژیش داهات با یەکێکتان بانگ بدا. کامەیشتـان قورئان زۆر دەزانی بەپێش بکەوی لەنوێژ (واتا ببیتە ئیمام) بیریشـیـان کردەوە لەمن زیاتریان نەبوو بەزانینی قـورئان چونکی لەڕێبواران فـیـرە قورئان ببووم منیـان کردە ئیـمامی خۆیان. کە تەمـەنیشم شەش یا حەوت سالێک بوو. دووگردێکم لەبەربوو کورت بوو وەکوو سەجدەم دەبرد هەڵدەکشا سـمـتم بەدیار دەکەوت کە عـەورەتە. ژنێکیـش لەتیـرەکـەمـان (قـەبیلە) گـوتی بۆچی لاسـمـتی ئیـمـامـەکـەتان داناپۆشن لەئێـمـە. ئینجـا پارچەیەکی عومانیـان بۆ کڕیم لەبەحرێن بۆیان کردم بەکراس. لەحەیاتی خۆم بەهیچ شتێک ئەمەندە کەیف خۆش نەبوومە ئەمەندەی بەم کراسە کەیف خۆش بووم.

(ش): شافعیەکان ئەمەیان کردوەتە بەڵگە (دەلیل) لەسەر دروست بوونی ئیمامەتی (منداڵ ممیز - واتە چاکەو خراپە لێک دەکاتەوە کە تەمەنی لەحەوت ساڵ یا حەوت ساڵ زیاترە). لەنوێژی فـەرز بەڵام نەیان کـردوەتە بەڵگە لەسـەر دانەپۆشـینی عـەورەت. چونکە لەوانەیە ئەوکاتە نەیانزانیوە داپۆشینی عەورەت واجبە.

## (غزوة أوطاس)
## غەزای ئەوطاس

**١٠٢٥: عَن أَبي موسى (ض) اللهُمَّ اغفِر لِعُبَيدٍ أَبي عامر اللهُمَّ اجْعَلْهُ يومَ القيامَةِ فوقَ كثيرٍ من خلقِكَ مِنَ الناس. فقُلْتُ وَلي فاستغفِرْ. فقالَ اللهُمَّ لِعبْدِ اللّهِ ابْنِ قيْسٍ ذَنبَهُ وادخِلْهُ يَوْمَ القيامَةِ مُدْخَلاً كريماً.**

### تەرجەمە

١٠٢٥: دەگێڕنەوە لەئەبو موسای ئەشعەری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) وەکـوو بەسـەرکەوتوویی وە بەتالانی زۆر لەغـەزای حونەین بۆوە لەژێر سـەرکردایەتی ئەبو

عـامر عـوبەیدی کـوڕی سلیم حـصـاری (مـامی ابو مـوسی) لەشکرێکی نارده ئەوطاس لەدیاری هەوازن. بۆ بەدواکەوتنی لەشکری هەوازن کە شکابوون لەغەزای حونەین. ئنجا گەیشـتە سەریان دەوردی دان بەدەستی ڕەبیعەی کوڕی ڕەفیع یا بەدەستی زوبەیری کوڕی عەوام کوژرا. ئەوانی تریش ڕایان کرد. ئەبو موسی گوتی منیشی لەگەڵ ئەبو عامری مامە نارد. ئنجا پیاوێکی بەنی جوشمی تیرێکی لەئەژنۆی ئەبو عامردا لەنێو چۆکی چەقی. گەیشتمە سەر ئەبو عامر گوتم مامە کامەبوو لەتۆیدا. بە ئیشارەکردن گوتی ئەوێ هێ بوو. منیش کەوتمە شوێنی ڕای کرد. تانم تێدا گوتم شەرم ناکەی ڕادەکەی. ڕاوەستا گەیشتمە کافرەکە. هەریەکە یەک شیرمان وەشاند. من ئەوم کوشت. پاشان بەعامرم گوت مامە خودا دوژمنەکەی تۆی کوشت. گوتی ئەم تیرەم لەئەژنۆ بینە دەرێ. وەکوو دەرم هێنا ئەختێ ئاو لەجێی تیرەکە هات. گوتی ئەی برازام لەمنەوە سەلام لەپێغەمبەر بکە. پێی بلێ دوعا بۆ بکا خودا لێم خۆش بی منیشی دانا لەجیاتی خۆی بەسەرکردایەتی لەشکرەکەی پاشان زۆری پێ نەچوو وەفاتی کرد. ئنجا چوومە خدمەت پێغەمبەر (د) لەماڵی خۆی لەسەر تەختێکی (مورمول) یەعنی چنراو بەپەتکە گوریس. بێ ڕایەخ. لەشوێنەواری گوریسەکان پشت و تەنیشتی پیرۆزی شووی بەستبوو. حیکایەتی خۆمانم بۆ گێڕایەوە. خەبەری ئەبو عامریشم پێدا پێی گوتم استغفارم بۆ بکا - داوای ئاوی کرد دەست نوێژی شووشت. پاشان هەردوو دەستی بلند کرد گوتی ئەی خودایا. گوناهی عوبەیدی ئەبو عامر داپۆشی. چاوم بە سپیاتی بن هەنگلی کەوت. پاشان گوتی. ئەی خودایا ڕۆژی قیامەت بیگێری لەسەرەوەی زۆر لەمەخلوقی خۆت لەنەوعی ئینسان. منیش پێم گوت بۆ منیش استغفار بکە (واتا داوای لێ بوردنم بۆ بکە لەخودا). گوتی ئەی خودایا گوناهی عبداللەی کوڕی قەیس داپۆشی و بیبەیە شوێنێکی بەکەرامەت و بەشەرەف و بی بەخشی ڕۆژی قیامەت.

## (غزوة الطائف)

## شەڕی طائف لەمانگی شەوال سالی هەشتەمی کۆچی ڕووی دا

١٠٢٦: عَنْ أمِّ سَلَمَةَ (ض) لايَدْخُلَنَّ هؤلاءِ عليكُنَّ: قالَهُ في مخنَّثٍ.

### تەرجەمە

١٠٢٦: دەگێڕنەوە لەدایکی ئیمانداران - ئومی سەلەمەی هندی کچی ئومەیەی مەخزومی ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) تەشریفی هاتەلام لەکاتێک براە

عبداللەی کوری نومیەم لابوو لەگەڵ موخەنەثێکیش. ئەم موخەنەثە کە ناوی (هیت بوو) بەعبداللەی کوری سەلەمەی گوت: تۆ پێم بلێ ئەگەر سبەینێ خودا طائفی بۆ فەتح کردن تەماشای کچی غیلان بکە لەقەڵەویان لەلای پێشەوە چوار لۆچی لەزگی دیارە. بەڵام لەلای پشتەوە هەشت لۆچ لەهەردوو تەنیشتی دیارە. پێغەمبەر (د) بەقسەیەکی توند بەئومی سەلەمەی گوت ئەم موخەنەثانە - واتە نەژن و نە مێرد- انە. با نێنە لات.

(ش): پاشان پێغەمبەر ئەم نەژن و نەمێردەی نەفی کرد بو حیما پاشان لەخلافەتی عومەر پیرو پەرێشان بووبوو دەرۆزەی دەکرد. ئیزن درا لە هەفتەی یەک جار دەهاتەوە مەدینە. ئەویش کۆلەی عبداللەی کوری نومیەبوو.

**١٠٢٧: عَن عبداللّه ابْنِ عُمَرَ (ض) اِنّا قافِلونَ اِنشاءَ اللّهُ فثَقُلَ عَلَيهِمْ الذهاب بلا فتح طائفِ. وَقالَ مَرَّةً ثانيَةً نقفُلُ فقال اغْدوا على القِتالِ فَغَدوا فاصابَهُمْ جراحٌ. فقالَ اِنّا قافِلونَ غداً اِن شاءَ اللّهُ فاعجَبَهُمْ فَضحِكَ النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم.**

### تەرجەمە

١٠٢٧: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوری حەزرەتی عومەر رەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو پێغەمبەر (د) طائفی ئابلۆقەدا پاشان بەسەریاندا زال بوو چونکی ثەقیف کوشتاری (اوطاس) و (کورا)یان کرد هاتنە طائف بەپێویستی‌یەکانی شەڕ بۆ ماوەی ساڵێک خۆیان لەقەڵات قایم کرد. دەرگایان کلیل دا (ابن سعد گوتی ماوەی ئابلۆقەی ئەوان هەژدە رۆژ بوو) ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی ئێمە بارکەرین ئەگەر خودا حەزبکا. ئەصحاب ئەم فەرموودەیان پێ گرانبوو. گوتیان ئێمە بەبێ گرتنی قەڵات چۆن برۆین جاری دووەم فەرمووی باردەکەین. پاشان فەرمووی سبەینێ زوو بۆ کوشتار برۆن. ئەصحاب دەورەیان لە قەڵات دا بوو بەشەرە تیر. چونکی ئەوان لەسەر شوورەی قەڵات تیریان دەهاویشت. باش کاری لەئەصحاب دەکرد ئەصحاب بریندارایان زۆربوو. تیری ئەصحابیش نەدەگەیشتە ئەوان. ئەوان بێ باک بوون لەزام و کوژران. ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێمە باردەکەین سبەینێ. ئەصحاب پێیان خۆشبوو پێغەمبەر بەگرژینەوە پێ کەنی بەسەر سورمانێکەوە لە حالی ئەصحاب کەجاری پێشوو پێیان ناخۆشبوو بێ گرتنی قەڵات برۆن دەفعەی پاشووش پێیان خۆش بوو.

١٢٠٨: عَنْ أَبي موسى الأشعري (ض) قال صلى الله تعالى عليه وسلم أَبشِرْ. فقالَ قد اكثَرْتَ عليَّ مِنْ أَبْشِرْ. فاقبلَ على ابي موسى وبلال كهيئةِ الغضبان فقالَ ردّ الُبشرى فاَقْبلا انتما. قالا قبلْنا ثمُّ دعا بقَدَحٍ فيهِ ماءٌ فغَسَلَ يدَيْهِ وَوَجهَهُ فيهِ وَمجَّ فيه ثمُّ قالَ اشرَبا منْهُ وافرغا على وجوهكما وَنحُوركما وَابْشِرا فأخذا القدَحَ ففعلا. فنادَت امُّ سلَمَةَ مِنْ وَراءِ السِّتْرِ. اَن افضِلا لأمكما. فأفضَلا لها مِنْهُ طائِفَةً.

## تەرجەمە

١٠٢٨: دەگێڕنەوە لە ئەبو موسى‌ی ئەشعەری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەبەینی مەککەو طائف لە (جعرانە) دابەزی بوو. منیش لەخدمەتی بووم پیلالی بانگدەریشی لەخدمەت بوو. عەرەبێکی بەدەوی هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) پێ‌ی گوت لەو بەلێن و وەعدەی بەمنت داوە ئەرێ بەجێ ناگەینی پێغەمبەر (د) فەرمووی موژدەت لێ بێ (واتا بەجێ دەگەینم). عەرەب گوتی زۆرجار بەمنت گوتووە موژدەت لێ بێ. (واتا: هیچیشمان لەتۆ نەدیت). پێغەمبەر (د) ڕووی پیرۆزی لەئەبو موسى و بیلال کرد بەشێوەی ڕق بوونەوە فەرمووی ئەم عەرەبە موژدەکەی منی ڕەد کردەوە ئنجا ئێوەش قبوولی بکەن (واتا: ڕقتان نەبێتەوە). گوتیان قبوولمان کرد ئەی پێغەمبەری خودا پاشان داوای جامە ئاوێکی کرد. دەست و دم و چاوی تیا شووشت ئاوەکەی ڕووکردەوە نێو جامەکە. پاشان فەرمووی لەم ئاوە بخۆنەوە. نەختێکیش بەدەم و چاوو سینگتان داکەن. جامەکەیان وەرگرت چلۆنی فەرموو وایان کرد ئومی سەلەمە دایکی ئیمانداران لەپشت پەردەوە بانگی کرد فەرموی لەپاش خۆتان لەم ئاوە نەختێکیش یارمەتی دایکتان بدەن - یەعنی یارمەتی من بدەن. ئنجا هەندێکیان لەئاوەکە بۆ هێشتەوە پێشکەشیان کرد.

ئنجا لێرەدا وەرگێڕ (مترجم) دەلێ (جَلَّ الله وَجَلَّ ماخصَّ اكرم رسله به من الحِلْم بِسورَة الم نشْرح لكَ صدرك).

١٠٢٩: عَنْ اَنَس (ض) اِنَّ قُريشاً حديثُ عَهدْ بجاهليةٍ وَمصيبَةٍ. وَاِنّي اردْتُ ان اخبِرَهُم وَاَتاَلّفهُمْ اَما ترضَوْنَ اَن يَرْجِعَ الناسُ بالدُّنيا وَترجِعونَ برسولِ اللّهِ صلى الله تعالى عليه وسلم الى بيوتِكُمْ قالوا بَلى. قالَ لو سَلَكَ الناسُ وادياً وسلَكَتِ الأنصارُ شِعباً. لسَلَكْتُ وادِيَ الأنصارِ وَشِعْبَ الأنصارِ.

## تەرجەمە

۱۰۲۹: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی. گوتی تالانی حونەینی هەموو دا بەموهاجیران هیچی بەئەنصار نەدا. ئەنصار گوتیان خودا لەپێغەمبەری خۆی خۆشبی. مالّ بەموهاجیران دەبەخشی ئێمەش بەجێ دێلی. کەچی شیری ئێمەش تکە دەکا لەخوێنی کافرانی حونەین. ئنجا پێغەمبەر (د) چەند کەسانێکی کۆکردەوە لەئەنصار. فەرمووی قورەیشی مەککە تازە موسولمان بووینە لەمێژ نی‌یە لەکافری جودا بووینەوە. زۆر مالّو موصیبەتیشیان تووش بووە بەم تەرزە خزم و کەسیان کوژراوە. نیشتمانیان گیراوە منیش دەمەوێ تۆلّەیان بۆ بکەمەوە. ئولفەتێکیان بخەمە ناو دلّ لەگەلّ دینی ئیسلام ببێن. ئەرێ ئێوە ڕازی نابن خەلکی بەمالّی دونیاوە بگەڕێتەوە مالی خۆی ئێوەش بە پێغەمبەری خوداوە (د) بگەڕێنەوە نیشتمان و خانوەکانتان. ئەنصار هەموو بەیەکەوە گوتیان ڕازین پێغەمبەر (د) ئەو کاتە فەرمووی کاغەزتان بۆ دەنووسم مالی بەحرین کە لەهەموو مالێکی فتوحات زیاترە. بەتایبەتی بۆ ئێوەبێ. گوتیان هیچ پێویستی‌یەکمان بە دونیا نی‌یە. پاشان فەرمووی ئەگەر عالەم هەمووی بەشێوێکدا بچی ئەنصاریش بەشێوێکدا بچی من ئەو شێوە هەلدەبژێرم کە ئەنصار پێ‌یدا چووە.

۱۰۳۰: عَنْ ابنِ عُمرَ (ض) اللهُمَّ اِنّي اَبْرَءُ اِلَيْكَ مِمّا صَنَعَ خالِدٌ.

## تەرجەمە

۱۰۳۰: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی. گوتی لەپاش گرتنی مەککە لەمانگی شەوال. لەپێش غەزای حونەین. پێغەمبەر (د) بەسەدو پەنجا کەس لەموهاجیرو ئەنصار خالدی نارده سەر بەنی جوذەیمەی کوڕی عامری کوڕی عبدی مەنافی کوڕی کینانە بۆ بانگهێشتنی دین. نەک بۆ کوشتار ئنجا وەکوو بانگی کردن. ڕاست و ڕاست نەیان گوت ئێمە موسولمان بووین. بەلکی دەیانگوت (صبأنا صبأنا) واتا: ئێمە دینی خۆمان جێ هێشت چووینە ناو ئاینێکی تر خالدیش بەوە ڕازی نەبوو دلی دانەکەوت بەو قسە ناڕاستەوخۆیەی کە غەیری ئاینی ئیسلامیش دەگرێتەوە دەستی کرد بەکوشتن و ئەسیر کردنیان. بەهەر یەکێکمان ئەسیرێکی پێ داین. هەتا ڕۆژێک خالد فەرمانی دا هەر کەسە ئەسیری خۆی بکوژی. منیش گوتم واللە من ئەسیری خۆم ناکوژم. نابێ هاوەلّەکانیشم بیان کوژن. هەتا دەیانبەینە خدمەت پێغەمبەر (د) ئنجا وەکوو بەخدمەت پێغەمبەر گەیشتین قسەکەمان پێ گوت. هەردو دەستی پیرۆزی بلندکرد فەرمووی ئەی خودایا من پەنا دەبەمە بەرتۆ لەو کاری خالد کردی دووجار وای فەرموو.

تووڕەیی پێغەمبەر (د) لەبەر پەلەکردنی خالدبوو بۆ کوشتنیان لەپێش ئەوەی بزانی مەبەستیان چی‌یە.

١٠٣١: عَنْ عليّ (ض) لَوْ دَخَلوها ماخَرَجوا منها الى يومِ القيامَةِ. الطّاعَةُ في المعروفِ.

**تەرجەمە**

١٠٣١: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی علی ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەشکرێکی بچووکی نارد لەژێر فەرماندەی عبداللەی کوڕی حوذافەی سەهمی ئەنصاری فەرمانی پێ کردن لەژێر فەرمانەکانی ئەو دەرنەچن. لەکارێک عبدالله ڕقی لە لەشکرەکەی بۆوە گوتی ئەدی پێغەمبەر (د) فەرمانی بە نێوە نەکرد. گوێ ڕایەڵی من بکەن. گوتیان (بەڵێ) گوتی دە کەوایە هەندێ دارو سووتەمەنی کۆبکەنەوە بۆ من. بۆیان کۆکردەوە. پاشان گوتی ئاگری تێ بەردەن ئاگریان تێ بەردا. پاشان گوتی هەمووتان بچۆنە نێو ئەو ئاگرە. ئەگەرچی لەشکرەکە بەچوونە ناو ئاگر غەمناک بوون. بەڵام ویستی‌شیان خۆیان فڕەبدەنە نێو ئاگر پاشان هەندێکیان هەندیکی‌یان دەگرت دەیانگوت ئێمە لەترسی ئاگر بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) هەڵاتین. ئێستاش لەسەر دونیا تووشی سووتان بین چلۆن دەبی. نیتر لەم قسانە بەردەوام بووین هەتا ئاگرەکە کوژاوە عبدالله کە سەرۆکیان بوو ڕقەکەی نەما. ئنجا ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر بچووبانایە نێو ئاگرەکە بەو فکرەی کە ناسووتێن چونکە بەقسەی ئەمیرو سەرکردەی خۆیان کردیە دەرنەدەچوون لەنێو ئاگر هەمو دەمردن هەتا ڕۆژی قیامەت. گوێ ڕایەڵی ئەمیرو سەرکردە لەفەرمان بەچاکەو فەرمان کردن بە نەکردنی خراپە وە لەکاری مەشروع هەیە. نەک لەوەی کە خودا پێی ناخۆشەو بێ شەرعی‌یە. حەدیثە (ان الأمر المطلقَ لايعمّ جميع الاحوال) واتا فەرمان هەموو حالەتێک ناگرتەوە. بەڵام ئەصحابەکانی پێغەمبەر واتێ گەیشتن. گوێ ڕایەلی سەرکردە لەهەموو ئەحوالێک لازمەو پێویستە هەتا لەکاتی تووڕەییش وە لەکاتی کردنی کاری خراپیش. ئنجا پێغەمبەر (د) بۆی ڕۆن کردنەوە کە گوێ ڕایەلی فەرمانی ئەمیرو سەرکردە تەنیا لەسەر کاری باشە بەڵام کارێک کە خراپ بێ خودا پێی خۆش نەبی نابی بیکەی و فەرمانەکەی نابێ جێ‌بەجێ بکەی.

١٠٣٢: عَن أَبي موسي الأشعَري (ض) يَسّر ولا تُعَسّر. وَبَشّرا ولا تنفّرا.

## تەرجەمە

١٠٣٢: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوری قەیس ابو موسی ئەشعەری رەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) ئەبو موسی و مەعاذی کوری جەبەلی نارد بۆ حوکم و فێرکردنی ئەحکامی دین و قورئان. یەمەنیش دووبەشە. مەعاذی لەلای سەرەوە دانا هەتا عەدەن. ئەبو موساشی لەلای خوارەوە داناو تەعینی کرد. پاشان فەرمانی بەهەردوویان کرد بە ئاسان کردن بن لەکاروبار زەحمەت دان و تەنگەتاوکردن مەنوێنن واتا کاران بۆ خەلک سووک بکەن بەموژدەو بەشارەت بن لەگەل خەلک بەرەواندنەوە مەبن. بێزاریتان لێ بکەن.

**١٠٣٣: عَن أَبي موسي (ض) ان النبيَّ صلى الله تعالى عليه وسلم بعَثَهُ الى اليَمَن فَسَألَهُ عَنْ أشرِبَةٍ تُصنَعُ بها فقالَ وماهيَ قالَ البِتْعُ. والمِزْرُ. فقالَ كُلُّ مُسْكِرٍ حَرامٌ.**

## تەرجەمە

١٠٣٣: دەگێرنەوە لەئەبو موسای ئەشعەری رەزای خودای لێ بی گوتی وەکو پێغەمبەر (د) ناردی بۆ یەمەن لەئەحکامی ئەوانە کە دەخورێتەوە. پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەوەی کە دەخورێتەوە چین؟. گوتی (بتعە) واتا نەبیذی هەنگوینە. وە (مزرە) یەعنی نەبیذی (جۆیە) - ئاوجۆ (کە ئێستا پێ‌ی دەلێن (بیرە). پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرچی مەستی و سەرخۆشی بدا حەرامە. لەهەرچی دروست کرابێ.

**١٠٣٤: عَن البَراءِ (ض) مُرْ أَصحابَ خالدٍ مَنْ شاءَ مِنهُمْ أَنْ يُعقِّبَ مَعَكَ فليُعَقِّبْ وَمَنْ شاءَ فليُقبِلْ.**

## تەرجەمە

١٠٣٤: دەگێرنەوە لەبەرائی کوری عازب رەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەگەل خالد ئێمەی نارد بۆ یەمەن (لەپاش گەرانەوەیان لە طائف و بەشێک لە دەسکەوت (غەنائم) لەجوعرانە (کە لەبەینی مەککەو طائفە) پاشان حەزرەتی عەلی ناردە جێگای خالد. فەرمانیشی پێ کرد بەهەوالەکانی خالد بلێ ئەوی هەوەسی لێیە با بچیتەوە ئەوی هەوەسیشی لێیە با بمینی لەبۆ شەرو غەزا لەگەل کافران. ئنجا یەکێک لەوانە کە

نەچوونەوە من بووم کە بۆ تەعقیبی غەزا لای حەزرەتی عەلی نەچوولام. پاشان چەند (اوقیە) پارەی زۆرم بەتالان گرت.

١٠٣٥: عَنْ اَبي بُرَيْدَةَ (ض) يا بُرَيْدَةُ اَتبغَضُ علياً. قُلْتُ نَعَمْ. قالَ لاتبغَضْهُ فأنَّ لَهُ في الخُمسِ اكثَرَ مِنْ ذلِكَ.

**تەرجەمە**

١٠٣٥: دەگێڕنەوە لە (بورەیدە) ڕەزای خودای لێ بی کوڕی خوصەیبی ئەسلەمی گوتی پێغەمبەر (د) حەزرەتی عەلی نارد بۆ لای خالد بۆ وەرگرتنی ١/٥ پێنج یەکی تالان. منیش لە دەروونی خۆم ڕقم لەعەلی بۆوە چونکی دیتم کچێکی کە ئەسیر کرابوو لەلایەن موسولمانان بۆخۆی هەلبژارد. بۆ سبەینەش خۆی شووشت. منیش بەخالدم گوت تۆ قەت تەماشای حەزرەتی عەلی ناکەی چی دەکا. وەکوو چووینەوە خدمەت پێغەمبەر (د) ئەوی لە عەلیم دیت بە پێغەمبەرم گوت فەرمووی ئەی (بوردە) ئەرێ ڕقت لەعەلی بوویتەوە گوتم (بەلێ) فەرمووی ڕقت لێ نەبێتەوە چونکی لەپێنج یەک لەمە زیاتر بەبەر عەلی دەکەوێ. ئنجا وەکوو پێغەمبەر ئەو هەواڵەی بە (بورەیدە) گوت. کە عەلی خیانەتی نەکردووە بەلکی کەمتری لەحەقی خۆی بردووە خوشەویستی‌یەکی زۆری دەربارەی حەزرەتی عەلی پەیداکرد.

١٠٣٦: عَنْ اَبي سعيدٍ(ض) الا تأمَنوني وَانا أمينُ مَنْ في السَّماءِ يأتيني خبرُ السَّماءِ صباحاً وَمساءً. فقامَ رَجُلٌ فقالَ يارسولَ الله اِتق اللّهَ. قالَ وَيْلَكَ اَولَسْتُ اَحقُّ اَهل الأرض ان يتقي اللّهَ. قالَ خالد ابنُ الوليد. يارسولَ اللّهِ الا أضربُ عُنقَهُ. قالَ لا لعلَّهُ ان يكونَ يُصلّي. فقالَ خالِدٌ وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يقولُ بلِسانِهِ ماليْسَ في قَلْبهِ. قالَ رسول اللّهِ صلى الله تعالى عليه وسلم اِنّي لَمْ اُومَرْ اَن انقُبَ قلوبَ النّاس وَلا اَشُقَّ بطونَهُمْ. قالَ ثمَّ نَظَرَ إلَيْهِ وَهوَ مُقَفٍّ. فقالَ اِنَّهُ يخرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هذا. قَوْمٌ يتلونَ كتابَ اللّهِ رَطْباً لايجاوزُ حناجِرَهُمْ يَمْرُقونَ مِنَ الدّينِ كما يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ. وَاَظُنَّهُ قالَ لَئِنْ ادركْتُهُمْ لاقتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثمودٍ.

**تەرجەمە**

١٠٣٦: دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی حەزرەتی عەلی لەیەمەنەوە بارچە زێڕێکی لەچەرمێکی دەباغ کراو بەجەفتی نارد بۆ پێغەمبەر (د)

هێشتا زێڕەکە لەخاکی مەعدەنی خۆی صاف و پوختە نەکرابوو گوتی لەنێوان چوار کەس دابەشی کرد بۆ وەرگرتنی دڵیان یەکی‌یان (عویەینەی کوڕی بەدر) دووەم (ئەقرەعی کوڕی حابسی حەنظەلی) سێیەم (زید الخیل کوڕی موهەلهەلی طائی) چوارەم (یاعەلقەمەی کوڕی عولاتەی عامری بوو یاخۆ (عامری کوڕی طوفەیلی) بوو یەکێک لەئەصحاب گوتی ئێمە موستەحەق ترین لەم چوارکەسە ئەم خەبەرە بە پێغەمبەر گەیشت (د) فەرمووی ئێوە من بە ئەمین نازانن من ئەمینداری ئەوانەم کە لەئاسمانن سبەینەو ئێوارە خەبەری ئاسمانم بۆ دێ. گوتی پاشان پیاوێکی ڕوومەت دەرپەڕیو و لەڕوو و چاو لەقوڕدا وە ناوچەوان بەرز ڕیش بۆر. وە سەر تراشاو لەسەر عادەتی ئەوانەی لەدەرەوەی شار نیشتەجێن وە بەپێچەوانەی خلافی عادەتی عەرەب کە پرچیان دەهێشتەوە وە گورج و دامەن هەلکراو. گوتی لەخوا بترسە ئەی پێغەمبەری خودا. پێغەمبەر فەرمووی واوەیلا بۆ تۆ. ئەدی لایق ترین ئەهلی عارد کە لە خوا بترسێ من نیم؟ پاشان پیاوەکە پشتی لە پێغەمبەر کرد. خالد گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەرێ لەملی نەدەم؟. فەرمووی نا بەلکی نوێژ دەکا. خالد گوتی زۆر نوێژکەر ئەو شتی بەزمان دەلێ لەنێو دلی نی‌یە. پێغەمبەر (د) فەرمووی من فەرمانم پێ نەکراوە دلی خەلکی کون بکەم وە زکی خەلکیش بدڕێنم پاشان تەماشای پیاوەکەی کرد پشتی لە پێغەمبەر کردبوو فەرمووی لەنەوەی ئەم پیاوە قەومێک پەیدا دەبن بەزمانێکی تەڕ قورئان دەخوێنن لەگەرووشیان تەجاوز ناکا بۆ نێو دلیان لەدین ئیسلام دەردەچن وەکو دەرچوونی تیر لەهەردوولای جەستەی نێچیر. وای بۆ دەچم فەرمووی ئەگەر تووشیان بێم لەکاتی خۆیان دەیان کوژم وە دەیان بڕێنمەوە بەکۆتایی وەکو قەومی صالح پێغەمبەر سەلامی خودای لێ بی. وەرگێڕو دانەری ئەم پەرتووکە لەوەی کە پێغەمبەر حوکمی بە کوژرانی ئەو کەسە نەکرد بەنوێژکردن دەردەکەوێ کە نوێژ لەپاش ئیمان و باوڕهێنان گەورەترین ئەرکانە چونکی تەعلیلی بە بەجێ گەیاندنی هیچ روکنی تر نەکرد غەیری نوێژ. لای کوری سەعد ئەم پیاوە نێوی (حەرقوصی کوڕی هیر) بوو لەنەوەی ئەم پیاوەش کە قورئان دەخوێنن بەئاوازی بەرزو بێ عیبرەت گرتن بەواتاو ئەحکامەکانی قورئان ئەم جۆرە کەسانە زۆرن لەسالی ١٣٧١ کۆچی. کە کاتی نووسینەوەی ئەم پەرتووکەیە.

## (غزوة ذي الخلصة)

### غەزای (ذي الخَلَصة) لەشاری غیلان و لەعاردی (خثعم)

١٠٣٧: اَلا تُريحُني مَنْ ذي الخَلَصَةِ. وَقالَ اللهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هادياً مَهْدِيّاً. فقالَ

رَسولُ جريرٍ وَالّذي بَعَثَكَ بالحَقِّ ماجئْتُكَ حتّى تَرَكتُها كانّها جَمَلٌ اَجْرَبٌ. قالَ فبارَكَ في خَيْلِ اَحْمَسَ وَرِجالِها خَمْسَ مَرّاتٍ.

## تەرجەمە

١٠٣٧: دەگێڕنەوە لەجەریر ڕەزای خودای لێ بی حەدیثی جریر لەجهاد ڕەت بوو وە لەە گـێـڕانەوەش بەم تەرزە ڕۆنی کـردووتەوە گـوتی پێـغـەمـبـەر (د) پێ‌ی گـوتم ئەرێ تۆ حـەسـانەوەیەک بەدڵی من ناگـەینی دەربارەی (ذی الخـەلـەصـە). چونکی ذی الخـەلەصـە خانوێک بوو لەشاری غیلان لەعاردی خەثعەم و بوجەیلە لەووڵاتی یەمەن پێ‌یان دەگوت (کعبـة الیمـانیـة) چونکی لە یەمەن بوو. بە کـەعبـەیشـیـان دەگوت (کـعبـة الشـامیـة) پێغەمبەریش (د) حالی وابوو هیچ شتێکی لەخوا بەیەک نەزانێ (شرک) پێ ناخۆشتر نەبوو لەسـەر دڵی پیرۆزی لەوەڵامی رسالەت پەنا (پێغەمبەر) گوتم: بەڵێ. سەدو پەنج سـوارم لەتیـرەی (ئەحـمـەس) هەڵبـژارد چونـکی خـاوەن ووڵاغ و سـوار چاک بوون. مـنیش سـوارێکی باش نەبووم خـۆم ڕانەدەگـرت لەسـەر ووڵاغ. ئەم قـسـەم بە پێـغـەمـبـەر گـوت. دەسـتـێکی پـیـرۆزی لەسـەر سنگم دا چاوم بەشـوێنەواری دەسـتی کـەوت لەسـەر سـینگم. فەرمووی: ئەی خودایا ڕای بگری. بیگێری بەشارەزاو ڕێ نیشـاندراو. ئیـتر بـڕای بـڕای (بەقطعی) جارێکی تر من لەووڵاغ نەکەوتم. ئنجا وەکوو جەریر گەیشتە یەمەن پیاوێک لەوێ هەبوو. فالی بەباسکە تیری دەگرتەوە پێ‌یان گوت ناردراوی پێغەمبەر لێرەیە. ئەگەر پێ‌ی بکرێ لەملت دەدا. هەتا ڕۆژێک فـالی دەگـرتەوە دیتی جـەریر لەسـەری ڕاوەسـتـاوە گـوتی باسـکەتیـرەکـانت بشـکێنە وە شـەهادەش بێنە و بلێ هیچ پەرسـتـراوی ڕاست نی‌یە خودا نەبێ ئەگەرنا لەملت دەدەم. تیرەکانی شکاندو شەهادەی هینا.

جەریر گوتی لەیەمەن بووم، تووشی دوو پیاو هاتم: یەکی‌یان دوکلاعبو ئەویتر ذو عەمر لەپاشایانی یەمەن بوو. چەند سوارێکی‌یان لەگەڵ دابوو. هەموومان ڕوو بە مەدینە بووینە ڕەفیق و هاوڕێ. منیش لە ئەحوالاتی پێغەمبەر قسەم بۆ دەگێڕانەوە. ذو عەمریان گوتی ئەگەر تۆ خەبەری پێغەمبەرمان پێ دەدەی. منیش خەبەرێکی ئەوت پێ دەدەم. ئەمە سێ ڕۆژ ڕەت بوو لە کات (أجَل)ی ئەو ئنجا ڕووبە مەدینە ڕۆیشتین. تووشی کاروانێک بووین لەمەدینەوە دەهات پرسیارمان لێ کرد لەم خەبەرە ناخۆشە گوتیان پێغەمبەر (د) کۆچی دوایی کردووە بۆلای خودای خۆی ئەبوبەکر لەجێگای ئەو دانیشووە.

(ش): زانینی ذی عەمر بەوەفـاتی پێغەمبەر (د) یا بە بۆهاتن (کەهانەت) بووە یاخۆ زانایەکی باشی حەدیث بووە لەهێماو رموزاتی حەدیثانی وەرگرتووە. یا بە هەر شێوەیەکی دیکە بێ. ئنجا جەریر وەکوو بوتخانەکەی شاری غیلانی وەکو تێکدا. ئەبو ئەرطانی کوڕی

ڕبیعەی کوڕی عامری کوڕی ئەزوەری بجلی بۆ موژدەبردنی تێکدانی بوتخانەی بیت
نیمانی نارده خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی سوێندم بەوزاتەی کە تۆی ناردووە بە
پێغەمبەرایەتی بەحەق من لەیەمەنەوە نەهاتوومە بۆ خدمەت تۆ هەتا بوتخانەکەم وەکوو
ووشترێکی گروو جێ هێشتووە. پێغەمبەریش (د) دوعای خێرو بەرەکەتی بۆ سوارو
پیادەکانی (ئەحمەس) کرد پێنج جار.

## (غَزْوَة سِيف البَحْر)
## شەڕی -سيف البحر-

(سيف البحر) بەکەسری سین یەعنی ڕۆخی دەریا. لەم غەزایە چووبوونە سەر ڕێگای
قافلەی قورەیشی‌یان ئنجا هەرچی قافلەیێکی قورەیشی‌یان هات هەموو گیرا -
سەرکردەشیان- ئەبو عوبەیدەی عامری کوڕی جەراحی فهری قورەیشی بوو.

١٠٣٨: عَنْ جابرٍ (ض) كلوا رِزقاً اَخرَجَهُ اللّهُ. أطعِمونا اِن كانَ مَعَكم أي الحوتُ.

### تەرجەمە

١٠٣٨: دەگێڕنەوە لە جابر ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر فەرمووی بخۆن
ڕزقێک کە خودا دەری خست دەرخواردی ئێمەیش بدەن ئەگەر لاتان هەیە. ئەمە بەڵگەو
دەلیلە کە ماسی کوشتنەوەی لەسەر نی‌یە.

**(سەربردەی ئەم حەدیثە)**

دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبدالله ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د)
لەساڵی هەشتەمی هیجری لەشکرێکی سێ سەد کەسی لەژێر سەکردایەتی ئەبو عوبەیدەی
نارده لای ڕۆخی دەریا. لەپاش ماوەیەک هیچ زادو زەخیرە نەما ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد
هەر کەسی مزوەدی (هەنبانە)ی خۆی بێنی. بەهەموو هنبانەکان دوو هەمبانە خورما
کۆبۆوە. لەپاشان هەر ڕۆژە. ئەبو عوبەیدە بەقەناعەت بۆ خاتری ژیان کەم کەمە
لەخورمایەکەی پێ دەداین هەتا تەواو بوو. پاشان دووبارە هەمبانەکانی زەخیرەی
کۆکردەوە. لەم کۆکردنەوەی دووەم هەریەکمان ڕۆژی یەک دانە قەسپمان پێ دەبڕا. لە کاتی
قسەگێڕانەوەی جابر یەکێک لە مەجلیس گوتی یەک دنکە قەسپ. ژیان بەڕێوە نابات.
جابر گوتی ئاخر ئەو دنکە قەسپەیش نەما. ئەگەرچی بەنەمانی زادو زەخیرەو خورمان

موتەئەثیر بووین بەڵام هەر ڕۆیشتین. هەتا گەیشتینە (بەحرین) لەناکاو دیتمـ نەهەنگێک لەو جێگایە کەوتبوو. بەقەد کێوێکی بچووک. ئەم لەشکرە سێ سەد کەسی هەژدە شەو لەو نەهەنگەمان خوارد هەر تەواو نەبوو.

(گەورەیی ئەم نەهەنگە وابوو حەزرەتی ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد. دوو هێسکی پەراسوویان لێک بەستن لەعارد چەقاندیان گوتی سوار ووشترێک بەبن دا ڕەت بو نەسوارەکە نە ووشترەکە بەنزیک پەراسوو نەکەوتن. لەگێڕانەوەیەکی تریش لە جابر ڕەزی خودای لێ بی. گوتی دەریا لەنەوعی عەنبەر- نەهەنگێکی بۆ فڕەداین. نیومانگ لەگۆشتەکەمان خوارد. بەرۆنەکەش خۆمان چەورکرد. هەتا جەستەکانمان لەلاوازی برسیەتی هەموو هاتەوە سەر حالەتی خۆی لەخۆشی و صحەت. پاشان وەکوو گەیشتینەوە مەدینە حیکایەتی ئەم حووتەمان بە پێغەمبەر گوت ئەویش فەرمووی بخۆن ڕزقێک کە خودا دەری خست. دەرخواردی ئێمەش بدەن ئەگەر لاتان هەیە. ئنجا هەندێکیان بۆ هێ خواردی وەکوو لەمەعنای حەدیث باسمان کرد.

(ش): لەم لەشکری حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب لەگەڵدابوو. ئەم لەشکرە ناوی بەلەشکری (خَبَط) چونکی لەبرسان پەلکەکانی داری سەلەمیان دەوەراند کە داری مازوو بەرووە یەعنی چڵوویان دەوەراند دەیان خوارد - خەبەط - بەواتای چڵوە.

وەکوو زۆر برسی بوونیان تووش بوو. قەیسی کوری سەعدی کوڕی عەبادە. بانگی کرد گوتی کێ خورمام لێ دەکڕی بەووشتر. بەمەرجێک خورمای لەمەدینە پێ بدەم. بەووشتری حازر. حەزرەتی عومەر فەرمووی نەی تەعجوب لەم منالە هیچ مالی نی‌یە بەقەرزیش دێنێ بۆ غەیری خۆی. ئنجا پێنج ووشتری کڕی بە پێنج وسق خورما. لەسێ جێگ ووشترەکانی کوشتەوە بەسێ ڕۆژ. ڕۆژی چوارەم ئەبو عوبەیدە نەی هێشت چی‌تر ووشتر بکڕێ. گوتی تۆ ماڵت نی‌یە فکرت وایە خۆت وەعدەی بەخلاف بدەی - بەرامبەر خەلکی. ئنجا قەیس وەکوو گەیشتەوە مەدینە چۆوە لای سەعدی باوکی. بەقەیسی گوت تۆ لەکاتی برسیەتی قەوم چیت کرد. گوتی ووشترم بۆ کوشتنەوە باوکی گوتی چاکت کرد. گوتی پاشان چی گوتی ووشترم بۆ کوشتنەوە. سەعد گوتی چاکت کرد. گوتی پاشان چی گوتی ووشترم کوشتەوە. سەعد گوتی لەڕۆژی چوارەم چیت کرد. قەیس گوتی لەکوشتنەوە قەدەغەکرام. باوکی گوتی کێ نەهی لێ کردی واتە قەدەغەی کردی گوتی ئەبوو عوبەیدەی سەرۆکم. سەعد گوتی بۆچی. قەیس گوتی ئەبو عوبەیدە پێی گوتم تۆ بێ مالی هەرچی هەیە مالی باوکتە سەعد گوتی. ئەوا چوار باغم لەخورما پێ دای. لەهەموویان کەمتر باغی -فەخذە- حاصلاتی هەر ساڵەی پەنجا وسقە.

ئەم نەهەنگەی خواردیشیان بۆیێ لەنەوعی عەنبەرە چونکی عەنبەر گیایەکی بێن خۆشە لەبن دەریا شین دەبی ئەم تەرزە ماسیەیش عاشقی بێنەکەیەتی ئەچی ئەی خوا

کەچی زەهیریشە بۆ ئەو. وەکوو خواردی ئەی کوژی دەریاش فڕەی دەدا. گۆشتەکەیشی بێنی خۆشە.

## (حديث ثمامة ووفد ابي حنيفة)

## حەدیثی ثومامەو وەفد ناردراوانی بەنی حەنیفە

**١٠٣٩: عَن اَبي هُرَيْرَةَ (ض) ماعِندَكَ يا ثُمامَةُ فقالَ عندي خيرٌ يا محمَّدْ اِن تقتُلْني تَقْتُلْ ذا دَم وَاِن تُنعِمْ تُنعِمْ علي شاكِرٍ وان كُنْتَ تريدُ المالَ فَسَلْ مِنْهُ ماشِئتَ. فَتُرِكَ حتّى كانَ الغَدُ. ثمّ قالَ لَهُ ماعِندَكَ يا ثُمامَةُ. فقالَ ماقُلْتُ لَكَ اِنْ تُنعِمْ تُنعِمْ على شاكِرٍ. فتَرَكَهُ حتّى كانَ بعدَ الغَد فقال ماعِندَكَ يا ثمامَةُ. قالَ عِندي ماقُلْتُ لَكَ. فقالَ اطلِقوا ثُمامَةَ. فقالَ اَشهَدُ ان لا اله الاّ الله واَشهَدْ اَنَّ محمداً رسول اللّهِ.**

### تەرجەمە

١٠٣٩: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) تیپە سوارێکی بۆ لای نەجد نارد پاشان پیاوێکی‌یان لەبەنی حەنیفە هێنا (لە ئەولادی نەجیم کوڕی جعبی کوڕی علی کوری بکری کوری وائلن). تیرەیەکی ناسراوون لەیەمامە دادەبەزن لەنێوان مەکەو مەدینە. نێوی (ثومامە کوڕی ئەثالب بوو) لەئەستوونەکانی مزگەوت لەئەستوونەیێکیان بەستەوە پاشان پێغەمبەر (د) لەحوجرەی پیرۆزی فەرموە دەرێ بۆ لای ئەو. فەرمووی چیت لایە ئەی ثومامە (واتا موسولمان دەبی نابی یاخۆ واتەکەی ئەوەیە بیرت چلۆنە دەرحەق بەمن کە چیت لێ دەکەم). گوتی بیری چاکەم هەیە دەرحەق بەتۆ. چونکی تۆ هەر چاکەت لایە ئەی محمد. ئەگەر بمکوژی خوێندارێک دەکوژی بەاستحقاقی خۆمە بۆ تۆ ستەم نی‌یە. وە ئەگەر چاکەشم لەگەڵ بکەی. چاکە لەگەڵ یەکێک دەکەی سوپاست دەکا. وە ئەگەر مالیشت دەوێ بخوازە نەوی مەیلت دەینی لەماڵ. پێغەمبەر وازی لێ هینا ئەو ڕۆژە بۆ سبەینە هاتەوە لای. فەرمووی چیت لایە ئەی ثومامە گوتی بەتۆم نەگوت. ئەگەر چاکە دەکەی چاکە لەگەڵ کەسێک دەکەی سوپاست دەکا ئەم جارەش وازی لێ هینا. هەتا بۆ سبەینە هاتەوە لای فەرمووی چیت لایە ئەی ثومامە. گوتی لای من هەر ئەمەندە هەیە کە پێم گوتی. فەرمووی ثومامە بەردەن ئاوێک لەمزگەوت نزیک بوو ثومامە خۆی شووشت هاتە ناو مزگەوت گوتی أشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله. ئەی محمد والله ئەبوو لەسەر ڕوویی عارد یەکێک هەندەی تۆ ڕقم لێی بێتەوە ئێستاش نی‌یە یەکێک هەندەی تۆ خۆشم بوێ. والله دینی تۆم لەهەموو دینان

زیاتر ڕق لێ دەبۆوە ئێستاش دینی تۆم لەهەموو دینان خۆشتر دەوێ. سوارەکانی تۆیش منیان گرت منیش دەم ویست بچمە عومرە. ئنجا فەرمانت لەسەر چی‌یە پێغەمبەر (د) مژدەی پێدا کە بەهۆی ئەوەی هاتی‌یە ناو ئاینی ئیسلام خێرێکی گەورەت پێ گەیی لەدین و لەدونیا وە ئەم هەموو گوناهانەی کە کردووتە هیچی نەما. فەرمانیشی پێ کرد عومرە بکا ئنجا وەکوو چووە مەککە یەکێک پێ‌ی گوت (صَبَوْتَ) یەعنی دەرچووی لە دینی خۆت بۆ دینێکی تر ثومامە گوتی نا واللە بەلکی موسولمان بووم لەگەڵ محمد کە نێردراوی خودایە (د). واللە دانە گەنمیکیشتان لەیەمامە بۆ نایێ هەتا پێغەمبەر ئیزن نەدا. ئنجا (ثومامە) کە سەرۆکی (یەمامە) بوو وەکوو چۆوە خەلکی یەمامەی قەدەغە کرد لەوەی کە هیچ شتێک ڕەوانەی مەککە بکەن. هەتا خەڵکی مەککە کاغەزیان بۆ پێغەمبەر (د) نووسی تۆ خۆت فەرمان دەکەی بە خزمایەتی پاراستن. ئێمەش پەرێشانین ئنجا پێغەمبەر (د) کاغەزی بۆ ثومامە نووسی کە شت قەدەغە نەکا بۆ مەککە:

دانەری ئەم پەرتووکەش دەلێ (سبحان اللە لەبەر گەورەیی خوداو گەورەیی و بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەر دەرحەق بە دوژمنانیشی).

**١٠٤٠: عَن ابن عباس (ض) لَوْ سَأَلْتَني هذه القِطعةَ ماأعطيتكها ولَنْ نقدوَ أمرَ اللّهِ فيكَ ولئِن أدبَرْتَ ليعقِرَنَّكَ اللّهُ وإنّي لأراكَ الذي أُويتُ فيهِ مارأيْتُ. وَهذا ثابتٌ يُجيبُكَ عَنّي. بيْنا أنا نائِمٌ رأيْتُ في يَديَّ سِوارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ فأهَمّني شأنهما، فأوحِيَ اليَّ في المنام انِ انفخهما فنفختهما فَطارا. فأوَّلْتُهما كذّابيْن يخرُجانِ بعدي. أحدُهما العِنسيُّ والآخَرُ مسَيلَمَةُ.**

### تەرجەمە

١٠٤٠: دەگێڕنەوە لەعەبداللەی کوری عەباس ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەساڵی دەیەمی کۆچی موسەیلەمەی کوڕی ثومامەی کوڕی کەبیری کوڕی جەیبی کوڕی حارث لەبەنی حەنیفە لەزەمانی پێغەمبەر هاتە مەدینە بەزۆر کەسی گوت لەهۆزی خۆی پێغەمبەر (د) تەشریفی بۆلای چوو ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شماسی لەگەڵدا بوو دواندەرو خەطیبی ئەنصار بوو. پیاوێکی قسەڕەوان بوو دەیگوت موسەیلەمە ئەگەر محمد لەکاروباری پێغەمبەرایەتی لەپاش وەفاتی من بکا بەجێ نشین و خەلیفەی خۆی باوەری پێ دەینم، ئەمە لەمەجلیسەکە وای گوت. پێغەمبەریش (د) پارچە شوورێکی دارخورمای بەدەستی پیرۆزی‌یەوە بوو چوو لەسەر سەری موسەیلەمەو ڕەفیقەکانی ڕاوەستا فەرمووی

ئەگەر ئەم پارچە دارەم لێ بخوازی ناتدەمێ لەحوکمی خودایش دەرحەق بەخۆت تەجاوزت پێ ناکرێ. وە ئەگەر ڕوو لەگوێ ڕایەلی و طاعەتی من وەربگێری بێ شک خودا بەهیلاکت دەدا. وە من تۆ دەبینم بەوکەسەی کە پێم نیشاندرا. لەو خەوی کە دیتم یەعنی چیت بەسەرهات) ئەگەر درێژەیش بدەیە قسەکردن (من هیچی تر جوابت نادەمەوە). ئەمە ثابت وەلامت دەداتەوە. پاشان پێغەمەر وازی لێ هێنا ڕۆیشت. ئنجا کوڕی عەباس گوتی لەخەونەکەی پێغەمبەر (د) نەگەیشتم. کە فەرمووی تۆ دەبینم بەوکەسەی کەپێم نیشاندرا لەخەو ئەوی کە دیتم. ئەبو هورەیرە خەبەری پێ دام. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی کاتێک من خەوتبووم دیتم دووبازنی زێر لەدەستەکانمە منیش زۆر پێ غەمناک بووم. چونکی خشڵی ژنان زەعیفی و زەبوونی دەگەیەنی. لەو خەوەدا وەحیم بۆ هات. فووەیکیان لێ بکە منیش فوێکم لێ کردن. هەردوو بازنەکان فڕین بەیەک فوو لەبەر حەقارەت و بێ نرخی خۆیان ئنجا تەعبیرم والێ داوە لەپاش من دوو درۆزنی گەورە بەدەردەکەون. بە بەدیارکەوتنی ئیدعای پێغەمبەرایەتی. یەکی یان ئەسوەدی عەنسی یە لە بەنی عەنس لە (صەنعا) دووەم (موسەیلەمەیە) لەبەنی حەنیفە لەیەمامە. ئنجا موعجیزەی پێغەمبەر بەم ئەرزە پێغەمبەر (د) کاربەدەستێکی لەصەنعا دانا ناوی (باذان) بوو وەفاتی کرد. عەنسی وەکوو خەبەری وەفاتی پێ گەیشت بەخۆی و هۆزەکەی هاتە (صەنعای) داگیرکرد ژنی فەرماندەرەکەش لەخۆی مارەکرد. پاشان پیاوێک ناوی (فەیروز) بوو. بەشەو چووە سەر ئەسوەدی عەنسی کوشتی ژنەکەو هەر ماڵێکی گرتبووی هەموی دەرهێنا. خەبەری بۆ مەدینە ڕەوانە کرد بەیەک شەوو ڕۆژ لەپێش وەفاتی پێغەمبەر (د) خەبەر گەیشتە مەدینە. بەڵام پێشتر پێغەمبەر (د) بەرێگای وەحی. خەبەری بەیاران و ئەصحاب دابوو. موسەیلمەش لەخەلیفایەتی ئەبو بەکری صدیق بەهێرشی عەسکەری ئیسلام. قەوم و قوەتەکەی تێکچوو موسەیلمەش بەدەستی (وەحشی) کە صەحابە بوو ڕووحی پیسی بۆ ئاگر ڕەوانەکرا.

## (قصة أهل نجران)
## چیرۆکی خەڵکی نەجران

١٠٤١: عَنْ حُذيفَةَ (ض) لأبعَثَنَّ مَعَكُمْ رَجلاً أميناً حقَّ أمينٍ. قُمْ يا ابا عُبَيْدَةَ ابنَ الجَرّاح فلّما قامَ قالَ رسول اللّهِ صلى الله تعالى عليه وسلم. هذا أمينُ هذهِ الأمَّةِ وفي روايَةٍ عَنْ انسٍ (ض) لِكُلِّ أُمَّةٍ زمينٌ وأمينُ هذهِ الأمَّةِ ابو عبيدةَ ابن الجَرّاحِ.

## تەرجەمە

**باسی نەجران**

١٠٤١: نەجران شارێکی گەورەیە بەینی لەگەڵ مەککە حەوت قۆناغە ئی دوو کەس بوو. ١- بەهەم: پێی دەگۆترا سەید. ٢- نێوی (عبدالمسیح) بوو پێی دەگۆترا (عاقب). دەگێڕنەوە. لەحوذەیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خودای لێ بی گوتی عاقب و سەید. هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) حارثی کوڕی عەلقەمەشیان لەگەڵدابوو کە سەرۆکی زانایانی نەجران بوو پێغەمبەر داوای لێ کردن بۆ ئاینی ئیسلام و قورئانی بۆ خوێندن. نەبوونە ئیسلام و ئینکاریان کرد. پێغەمبەریش (د) فەرمووی ئەگەر ئینکاری قسەی من دەکەن وەرن من و ئێوە (مولاعەنە) دەکەین بەم تەرزە هەردوولامان لەخودا دەپاڕێینەوە لەعنەت لەو کەسەبی ناحەقە. ئەوانیش ویستی‌یان مولاعەنە بکەن. پاشان سەیدیان بە عاقبی گوت ئێمە مولاعەنە ناکەین. چونکی ئەگەر پێغەمبەر بی و مولاعەنەش بکەین نەجاتمان نابی ئێمەو وجاغیشمان و نەوەکانیشمان بەهیلاک دەچین و دەفەوتێن. بەهەر چەند ماڵ حوکم دەکەی پێت دەدەین ئنجا پێغەمبەر (د) لەگەڵیان پێک هات. لەسەر ئەمە کە هەزار خیلعەت لەمانگی ڕەجەب وە هەزار خیلعەتیش لەمانگی سەفەر بدەن. لەگەڵ هەر خیلعەتێکیش یەک وەقیە زێڕ هەبێ. گوتیان دەدەین ئەمەندەی بتەوێ بەڵام پیاوێکی ئەمین مان لەگەڵ بنێرە. ئەمین نەبێ لەگەڵمان نەنێری. پێغەمبەر (د) فەرمووی پیاوێکی ئەمینتان لەگەڵ دەنێرم بەڕاستی ئەمین بێ پاشان فەرمووی هەڵستە ئەی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح. وەکوو هەڵستا پێغەمبەر (د) فەرمووی. ئەمە ئەمینی ئەم ئومەتەیە. لەئەنەس دەگێڕنەوە پێغەمبەر فەرمووی بۆ هەر ئومەتێک ئەمینێک هەیە ئەمینی ئەم ئومەتەیش ئەبو عوبەیدەی کوری جەراحە.

## (قدوم الأشعريين)

## هاتنی ئەشعەریەکان

١٠٤٢: عَن اَبي موسى (ض) اَجَلْ ولكِن لا أحلفُ على يمينٍ فأرى غيرَها خيراً منها الاَّ اَتيْتُ الذّي هو خيرٌ منها وفي روايةٍ وَتحلّلْتُها.

## تەرجەمە

١٠٤٢: دەگێڕنەوە لەئەبو موسى‌ی ئەشعەری ڕەزای خودای لێ بی لەساڵی نۆیەمی

کۆچی لەگەڵ چەند کەسێک لەئەشعەریان هاتینە خدمەت پێغەمبەر (د) ووشترمان لێ :اواکرد گرانباری و ئەشیای خۆمانی لێ بارکەین بۆ غەزای تەبووک داواکەمانی قبوول نەکرد. دووبارە داوامان لێ کرد ئەمجارە سوێندی خوارد ئەشیاتان بارناکەم. پاشان زۆری پێ نەچوو پێنج ووشتری بۆ ناردین هەندێکیش دەلێن شەش. لەو ووشترانەی کە بەتالآن هاتن لەنێو کافران وەکوو ووشترەکانمان وەرگرت ئێمە لەنێو خۆمان گوتمان بووینە هۆی -غەفلەتی- پێغەمبەر لەسوێندەکەی ئێمە بەهیلاک دەچین. من خۆم چووم بۆ خدمەت پێغەمبەر (د). پێم گوت تۆ سوێندت خوارد. ئێمەو ئەشیای ئێمە هەڵنەگری. کەچی ئەوا ئێستا هەڵت گرت. فەرمووی (بەڵێ) وایە. بەلآم من سوێند لەسەر شتێکی وا ناخۆم کە باشترێک لەو شتە هەبێ ئیلا مەگەر ئەو شتە باشترەکە دەکەم. لەریوایەتێکیش فەرمووی کەفارەی سوێندم دا.

## (قدوم أهل اليَمَنْ)
## هاتنی خەڵکی یەمەن

**١٠٤٣: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) اَتاكُمْ اَهلُ اليَمَنِ هُمْ اَرَقُّ اَفئِدَةً وَالْيَنُ قلوباً الأيمانُ يَمانٍ والحكمةُ يَمانِيَةٌ والفخرُ والخيلاءُ في اَصحابِ الأبِلِ والسَّكينَةِ والوِقارُ في اَهْلِ الغَنَمِ.**

### تەرجەمە

١٠٤٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەساڵی وفود کەساڵی نۆیەمی هیجری بوو وەفدی حیمیەر لەیەمەنەوە هاتن بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) ڕووی قسەکردنی لەئەیحاب کرد چەند کەسانێکیش لەئەنصار لەوێ بوون. فەرمووی خەڵکی یەمەن هاتنە لاتان. ئەوان کیسەی دڵیان تەنک ترە. زووتر قسەی ڕاست دەچێتە ناودڵیان. وە دڵیشیان نەرمترە زووتر قسەی ڕاست لەناو دڵیان دەچەقی. ئیمان دەدرێتە پاڵ خەڵکی یەمەن. زانینی ئەحکامی شەرعی و قسەیەک کە لەگەڵ ڕاستی و حەق ڕێک بکەوی یەمەنی‌یە دڵیان کانگاو مەعدەنی حیکمەت و ئیمانە لەهەموو زەمانێک چونکی حەدیثی ڕاست و صەحیحی تریشیان دەرحەق هاتووە لەخۆبایی بوون و خەڵکی تر بەکەم زانینیش لەنێو خاوەن ووشترە. هێمنی و بەڕێزی و خۆ بەکەم زانین لەنێو خاوەن مەڕە.

## (حجة الوداع)
## حەجی ماڵ ئاوایی

١٠٤٤: عَن أَبي بكرَةَ الزَّمانُ قد استدارَ كهيئَةِ يَوْمَ خَلَقَ اللّهُ السَّموات والأرضَ السَّنَةُ اثناعَشَرَ شهْراً. منها اربَعَةٌ حُرُمٌ ثلاثَةٌ متواليات. ذو القعدةِ وذوالحَجَّةِ والمحرَّمْ وَرَجَبُ مُضَرَ الذي بيْنَ جماذَي وَشعبانَ. أيُّ شَهْرٍ هذا. اليسَ ذاالحجَّةِ. قُلْنا بَلى قالَ وأيُّ بَلَدٍ هذا اَلَيْسَ البَلْدَةَ. قُلْنا بَلى قالَ فأيُّ يَوْمٍ هذا. اَلَيْسَ يَوْمَ النَّحرْ. قلنا بَلى قالَ فأنَّ دِمائكمْ واموالكُمْ وَاعراضكُمْ عليكُمْ حَرامٌ كَحرمَةِ يَوَمِكُمْ هذا في بلدكُمْ هذا في شهركُمْ هذا. وَستلقَوْنَ ربكمْ. فيسئلكُمْ عنْ أعمالكُمْ الا فلا تَرجِعوا بَعْدي ضَلّالاً يَضْرِبُ بعضكم رِقابَ بعْضٍ. الا لَيُبلِّغَ الشّاهِدُ الغائِبَ فَلعَلَّ بَعْضَ مَنْ يُبَلِّغُهُ اَن يكونَ أوعى له مِنْ بعض مَنْ سَمِعَهُ ثمَّ قالَ اَلا هَلْ بَلَّغْتُ مرَّتَيْنِ.

### تەرجەمە

١٠٤٤: دەگێڕنەوە لەئەبو بەکرە نەفیعی کوری حارث ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) ڕۆژی جەژنی قوربان کەپێی دەلێن ڕۆژی (نەحر) لە حجە الوداع لە (مینا، کە حەجی یەکەمی پاش کۆچ کردنی بوو بۆ شاری مەدینە. وە ئاخری هەموو حەجەکانی مەککەشی بوو. چونکی لەپێش کۆچ کردنی بۆ مەدینە هیچ ساڵێک حەجی تەرک نەدەکرد - واتە هەموو ساڵێ حەجی دەکرد. فەرمووی زەمانە گەڕاوە سەر شێوەی خۆی لەو ڕۆژە کە خودا ئاسمانەکان و عاردی دروست کرد. بەم تەرزە ساڵ دوازدە مانگە چوار مانگیان بەقەدرو بەڕێزن لەم چوارانە سێیان لەدوو یەکترین.

ذو القعدەو ذو الحجەو موحەڕەم. وە مانگی ڕەجەبیشە کە (مضر) لەهەموو عەرەبێک زیاتر ڕێزی گرتووە. کە کەوتوەتە بەینی دوو جماذو مانگی شەعبان. پاشان فەرمووی ئەم مانگە چی مانگێکە. ئێمەش گوتمان خوداو پێغەمبەری خودا دەزانی. پاشان قسەی نەکرد. هەتا واتێ گەیشتین بەغەیری ناوی خۆی نێوی دەبا. فەرمووی ئەدی ذالحجە نی‌یە؟. گوتمان بەڵێ ذی الحجەیە.

پاشان فەرمووی ئەم شارە چی شارێکە گوتمان خوداو پێغەمبەری خودا دەزانی. پاشان قسەی نەکرد. هەتا واتێ گەیشتین نێوێکی تری لێ دەنێ. پاشان فەرمووی ئەدی ئەم شارە ئەو شارە نی‌یە کە پێویستە ڕێزی بگیرێ کە شاری مەککەیە. گوتمان (بەڵێ هەوە). پاشان فەرمووی ئیمرۆ چی ڕۆژێکە. گوتمان خودا پێغەمبەری خودا دەزانی پاشان قسەی نەکرد.

هەتا واتێ گەیشتین ناوێکی تریلێ دەنێ پاشان فەرمووی ئەدی ئیمرۆ (یوم النحر) واتا ڕۆژی کوشتنەوە نیە کەرۆژی یەکەمی جەژنی قوربانە: گوتمان بەڵێ. پاشان فەرمووی بەڕاستی خوێنتان و ماڵتان و عەرزو نامووس و ئەخلاقتان لەسەر ئێوە ڕێزگیراوە وەکوو ڕێزگرتنی ئیمرۆتان کە یوم النحره. لەم مانگەتان کە (ذی الحجەیە) لەم شارەتان کە مەککەیە. بەخزمەت خودای خۆیشتان دەگەن ڕۆژی قیامەت. لەهەموو کردەوەتان دەپرسی ئاگاداربن لەپاش من خۆتان نەگێڕن بەزالم و ستەمکار هەندێکتان لەملی هەندێکتان بدەن لەبەر بەربەرەکانی و حەسوودی بەیەکتر بردن لەسەر دونیا (واتا: خوێنی یەکتریتان مەڕێژن. پەردەی عەرزو ناموس و ئەخلاقی یەکتریتان مەدڕێنن. ماڵی یەکتریتان بەحەلال مەزانن بێ ئیزن). ئاگادارین با ئەوانەی لێرە حازرن ئەم قسانەی من بەوانە بلێین کە لێرە نین. چونکە دروستە هەندێ لەوانەی پێیان دەگوترێ وە گوێیان لە پێغەمبەر بووە (د) ئەم قسانەی من لەبیر ناکەن باشتریان لەبیرە لەوانەی کە بەخەڵکی ڕادەگەیێن. پاشان فەرمووی، ئاگادارین من ئەرێ قسەی خۆم ڕاگەیاندو تەبلیغی خۆم کرد (دووجار وای فەرموو) یەعنی من فەرمانی خۆم بەجێ گەیاند کەڕاگەیاندنەو هیچیش لەسەر نیردراو نیە ڕاگەیاندن نەبێ. خودایش کەیفی خۆیتی ئەگەر بەقسەم بکەن پاداشتتان هەیە بەقسەشم نەکەن جەزاتان دەبینن.

## (غزوة تبوك) وهي غزوة العُسْرة
## شەڕی تەبووک کە شەڕی تەنگانەیە

١٠٤٥: عَنْ أَبي موسى (ض) واللّهِ لاأَحمِلُكُمْ على شيءٍ. خُذْ هذين القرينَيْنِ. وهذاين القرينينِ. فانطلِقْ بِهِنَّ الى أَصحابِكَ. فقل إِنَّ اللّهَ. أو قالَ إِنَّ رسولَ الله صلى الله تعالى عَلَيهِ وسلّم. يحملكُمْ على هؤلاءِ فاركبوهنَّ خَرَجَ الى تبوكَ.

**تەرجەمە**

١٠٤٥: دەگێڕنەوە لە ئەبو موسیی ئەشعەری ڕەزای خودای لێ بی گوتی ڕەفیقەکانم منیان نارد بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) بۆ چەند ووشترێک بۆ ئەشیا هەڵگرتن و سواریان بۆ غەزای تەبووک کە بەینی لەگەڵ شام بە کاروان یازدە قۆناغە. منیش پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا. هەوالەکانم منیان بۆ خدمەت تۆ ناردووە. کە هەلیان بگری فەرمووی والله هەلتان ناگرم لەسەر هیچ شتێک وە من بێ ئاگا لەکاتی تووڕەبوون چوومەلای. ئەشم

زانی رقەکەی لەسەر چی‌یە منیش بە غەمناکی گەڕامەوە لای برادەرەکانم لەبەر ئەوەی پێغەمبەر هیچی نەدامێ. وە لەبەر ئەمەیش ترسم لەخۆیشم هەبوو شتێکی لەمن هەست کردبێ و رقی لێم بووبێتەوە. خەبەری ئەم پێ نەدانەم بەبرادەرەکانم گوت. زۆری پێ نەچوو لەنکاو گوێم لەبلال بوو بانگی من دەکرد دەیگوت بەدەنگی بەرز ئەی عبداللەی کوری قەیس. منیش وەلامم دایەوە گوتی وەرە پێغەمبەر (د) داوات دەکا منیش چووم پێغەمبەر (د) فەرمووی بگرە ئەم دوو ووشترە. وە ئەم دوو ووشترەیش هەتا شەش ووشتر. فەرمووی بیانبە بۆ رەفیقەکانت. پێش‌یان بلێ خودا یا پێغەمبەری خودا لەسەر ئەم ووشترانەتان باردەکا. ئنجا سواریان بن. منیش ووشترەکانم بۆ هاوەلەکانم بردو پێشم گوتن پێغەمبەر (د) لەسەر ئەم ووشترانەتان باردەکا. ئنجا سواریان بن. منیش ووشترەکانم بۆ هاوەلەکان بردو پێشم گوتن پێغەمبەر (د) لەسەر ئەم ووشترانەتان باردەکا «بەلام والله من یەقەتان بەرنادەم هەتا هەندێکتان لەگەلم نێن بۆلای ئەوان کەسانی گوێ‌یان لەپێغەمبەر بوو کە چلۆن رەدی کردمەوە بەغەمناکی گەڕامەوە لاتان نەوەک بیربکەنەوە من حەدیثێکم بەئێوە گوتووبێ و پێغەمبەریش وای نەگوتبێ. رەفیقەکان گوتیان. والله تۆ لەهەمو قسەیەک لای ئێمە باوەڕ پێ کراوی هەرچی بلێی بەتۆ باودڕ دەکەین. بەلام هەر شتێکی ئەتۆ پێت خۆش بی وا دەکەین ئەگەر حەزدەکەی با یەکێکمان با لەگەلت بێ ئنجا چەند کەسانێک لەگەلی چوونە لای ئەو کەسانەی گوێ‌یان لەوە بوو بو کە پێغەمبەر ووشترەکانی نەدایێ.وە گوتیان ئەبو موسی راست دەکا.

(ش): لێرە واتێ دەگەین کە سوێند شکاندن لەکاروباری مەشروع و بەجێ وە فدیە دان باشترە لەدەوام کردن لەسەر سوێند. ئەم حەدیثە لەگەل حەدیثی هاتنی ئەشعەریان کەرەت بوو لەپێش ئێرە بەدوو حەدیث باشترە. ئەگەرچی هەردوویان یەک حەدیثن بەلام لەوێ کە پێنج ووشتربوو. وە لێرەش شەش بوو لەوانەیە لەپاش پێنج ووشتر یەکێکی تریشی پێ دابی بۆیی لێرە بوو بە شەش. گێرانەوەی جۆربەجۆریش دروستە. (ئەمە لەعەینی باس دەکا).

**١٠٤٦: عَنْ سَعْدِ ابْنِ اَبي وقّاص (ض) قالَ صلى الله عليه وسلم لِعَلّي حينَ استَخْلَفَهُ عَلى المدينَةِ في تبوك. الا ترضى اَن تكونَ مِنّي بِمَنزلِةِ هارونَ مِنْ موسى. اِلاّ انَّهُ لَيْسَ نبيٌ بَعْدي.**

### تەرجەمە

١٠٤٦: دەگێرنەوە لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) بۆ تەبووک تەشریفی دەرچوو- ئیمامی عەلی لەجێگای خۆی دانا لەشاری مەدینە حەزرەتی عەلیش فەرمووی تۆ من دەکەیە جێ نشینی خۆت لەنێو ئافرەت و منداڵان. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەرێ تۆ ڕازی نابی دەرحەق بە من لەمەقامی هارون بێ دەرحەق بەموسی. ئەمەندە فەرقە هەیە هیچ پێغەمبەر لەپاش من نابی.

(ش): رافزیەکان (روافض) هەموو چینەکانی شیعە ئەم حەدیثەیان کردوەتە بەڵگەو دەلیل کە خەلافەت لەپێشدا حەقی عەلی بووە. ئەوان ئەصحابەکانی پێغەمبەر بەکافر دادەنێن چونکی لەخەلافەت خەڵکی تریان پێش خستووە لەسەر عەلی. بەلکی هەندێکیان (عەلی) خۆیشی بەکافر دادەنێن چونکی داوای حەقی خۆی نەکردووە. کە بەڵگەو حوجەتیکیشیان بەدەستەوە نی‌یە لەم حەدیثە. چونکی پێغەمبەر (د) موەقەتەن هەتا لەتەبووک دێتەوە فەرمووی لەمەدینە دانیشە. وەکوو دانیشتنی هارون لەجێگەی موسی هەتا لەکێوی طور دێتەوە. نەک بلێ لەپاش وەفاتی منیش جێ نشینی من بە. بەدەلیلی موشەبەهو بهی کە هارونە نەبووە خەلیفە لەپاش موسی چونکی هارون چل ساڵ لەپێش موسی مردوە بەم قسەیەش (ألا انَّهُ ليسَ نبيٌّ بعدي) پەیوەندی عەلی بە پێغەمبەر پێغەمبەرایەتی نەبووە. دەمینێتەوە پەیوەندی لەجهەت خەلیفایەتی. خەلیفایەتیش یا لەپێش مردنە یا لەپاش مردنە. بەمردنی هارونیش لەپێش موسی خەلیفایەتی پاش مردن لەبەرچووە دەرێ چونکی مادام موشەبەهو بهی کە خلافەتی هاروونە خەلافەتی پێش وەفات بێ موشەبەهیش کە خەلافەتی عەلی‌یە خەلافەتی پێش وەفاتە هەتا لەتەبووک دەگەڕێتەوە بەس.

## قسەی کەعبی کوڕی مالک
## ڕەزای خوای لێ بی و فەرموودەی خودا
## (وَعلى الثلاثة الذين خُلّفوا)

١٠٤٧: عَنْ كَعْب ابْن مالك (ض) مافَعَلَ كَعْبٌ. ثمَّ قالَ لي تعالَ ماخَلَّفَكَ اَلَمْ تكُنْ قَدْ اتَبعْتَ ظَهَرِكَ. فقُلْتُ بلَى اِنّي لأرجو فيه عفوَ اللّهِ. لا واللّه ماكانَ لي مِنْ عُذْر. فقالَ النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم. مَا هذا فَقَدْ صَدَقَ فقُمْ حتّى تقضي اللّهُ فيكَ. اَبْشِرْ بخَبرِ يَوْمٍ صَرَّ عَلَيْكَ منذُ وَلَدَتْكَ اُمُّكَ. قُلْتُ أمِنْ عِندِكَ يارسولَ الله أم مِنْ عِندِ

اللّهِ. قالَ لا بَلْ مِنْ عِند الله. قُلْتُ يارسولَ اللّهِ اِنَّ مِنْ توبَتي اَن اَنخَلِعَ مِنْ مالي صَدَقَةً الى اللّهِ والى رسولِ اللّهِ قالَ أمسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مالِكَ فهوَ خيرٌ لَكَ. وَانزَلَ اللّهُ تعالى. لقد تابَ اللّهُ على النبيِّ والمهاجرينَ والأنصارِ الى قَوْلِهِ وكونوا مع الصّادقينَ

## تەرجەمە

١٠٤٧: دەگێڕنەوە لەکەعبی کوری مالکی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی لەهیچ غەزاییێک من لە پێغەمبەر (د) پاش نەکەوتبووم. لەغەزای تەبووک نەبێ لەغەزای بەدریش. ئەگەرچی پاش کەوتم. بەلاّم هیچ کەسێک گلەیی لێ نەکردم چونکی پێغەمبەر (د) بەئیرادەی کاروانی قوڕەیش چوبوە دەرێ بەنیەتی کوشتار نەچوبوە دەرێ. لەپاش خودای گەورە بەبێ میعاد لەگەلّ دوژمن تووشی یەکتری هینان وە من لەپێش هیجرەت و کۆچ کردن لەمەدینەوە لەکاتی حەج کردن بۆ مەککە چووم لە (منا) شەوی عەقەبە حازربووە وەکوو وەعدەمان بە پێغەمبەردا لەسەر ئایینی ئیسلام و حەواندنەوەیو یارمەتی دانی بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمنان وە ئەو پەیمانی ئەوێ شەوێ بەستمان بە غەزای بەدر ناگۆڕمەوە. وە ئەگەرچی غەزای بەدریش لای خەلّکی بەناوو دەنگ ترە چونکی شەوی -عەقەبە- بووە بناغەی ئایینی ئیسلام ئنجا بابێینە سەر باسی هۆیەکانی و ئەسباب پاش کەوتنم لەغەزای تەبووک چی بوو. بەڕاستی پاش کەوتنم لەغەزای تەبووک بێ -عوزربوو- چونکی ئەو تواناو ئیقتداری ئەوکاتە هەمبوو لەسەر غەزاو پاشیش کەوتم لەهیچ کاتێک نەم بوو. واللە لەهیچ غەزاییێک دوو ووشتری سواریم نەبووە لەغەزای تەبووک دوو ووشتری سواریم هەبوو. درێغی و قصورێکی تریشم نەمەبوو. لەهیچ غەزایەک ڕاست و ڕاست پێغەمبەر (د) نەی فەرموو بۆ فلان غەزا دەچم بەلّکی هێماو تەوریەی دەکرد بەم تەرزە غەزایەکی تری لەزەینی خەلّکی دەخست. غەزای تەبووک نەبێ زوو ڕاست و ڕاست خەبەری دا بۆ غەزای تەبووک دەچین چونکی سەفەرێکی دووربوو زۆریش گەرمابوو برینی چۆل و بیابان خۆ حازرکردنێک و ئەسبابی دەوێ هەتا عالەم خۆی ئامادە بکا بۆ غەزا لەشکری ئیسلامیش لەخدمەت پێغەمبەر ئەمەندە زۆربوو بەهیچ دەفتەرێک نەدەژمرا. لای حاکم گوتیتی زیاتربوو لە (٣٠) سی هەزار. خەیالم کرد لەە ئیزدیحام و قەلەبالغی زۆر. ئەگەر پیاوێک دیارنەبێ بزانرێ کە خۆی شاردووتەوە بەوەحی

نەبێ وە ئەم غەزایەی پێغەمبەریش (د) لەکاتی مێوەو خورما پێگەیشتن بوو. ئەهاوینێکی نزیک بەپایزبوو بەرسێبەر خۆش بوو منیش وەکوو ئەصحابەکانی تر بەنیەتی خۆ ڕێک خستن غەزای سبەینان زوو لەماڵی خۆمان دەهاتمە دەرێ هێوارانیش دەهاتمەوە هیچیشم ڕێک نەدەخست. لەنێو دڵی خۆم دەمگوت خۆڕێک خستن هەندە گرنگ نی‌یە هەرکاتێک مەیل بکەم و بمەوێ دەتوانم خۆم ئامادە بکەم: ئیتر ئەم سستی و ڕەخاوەت کردنەم درێژەی پێ دام هەتا کاتێک هەموو خەڵکی بەلەشکری ئیسلامەوە لەمەدینە چووە دەرێ کە منیش هیچ خۆم ئامادە نەکردبوو. پاشان لەدڵی خۆم گوتم. قەی ناکا سبەی بێ دووسەبەی منیش خۆم ئامادە دەکەم. پاشان دەیانگەمێ. لەپاش جودابوونەوەی لەشکری ئیسلام گەڕامەوە خۆم ئامادە بکەم دیسان هیچم نەکرد. ئیتر ئەم حاڵەتە لەسەر من دەوامی کرد هەتا لەشکر چەند قۆناغیان بڕی. ویستم باربکەم وە پێیان بگەم. ئەی کاشکی ئەمەم بکردایە بەکورتی بۆم تەقدیر نەکرابوو ئەم غەزایەم بەنصیب بێ. نەچووم لەمەدینە مامەوە ئنجا لەپاش ڕۆیشتنی لەشکری پێغەمبەر وەکوو لەخانووی خۆم دەهاتمە دەرێ بەمن بوایە -غەیری منافق و بێ دەسەڵات و بێ هێزەکان نەبێ کەسم نەدیتبوایە. پێغەمبەریش (د) هەتا تەبووک منی یاد نەفەرموو. پاشان لەنێو ئەصحاب دانیشتبوو. (فەرمووی کەعب چی کرد). پیاوێکیش لەبەنی سەلەمە گوتی ئەی پێغەمبەری خودا - لەخۆبایی بوون و خۆ بەگەورە زانینی ئەو ئەوی قەدەغەکرد لەهاتن. مەعاذی کوڕی جەبەل گوتی قسەیەکی خراپت کرد. واللە ئەی پێغەمبەری خودا چاکە نەبێ هیچی ترمان لە کەعب نەدیوە. پێغەمبەر (د) هیچ قسەی نەکرد کەعب گوتی وەکوو خەبەرمان پێ گەیشت کە گەڕانەوە بۆ مەدینە. خەیالم کرد هەندێ درۆ ڕێک بێخم. بیرم کردەوە بەچی قسەیەک لەتووڕەیی پێغەمبەر (د) خۆم نەجات دەم. لەم بارەوە پرس و ڕام بەئەهلی خانووی خۆم دەکرد پاشان وەکوو گوترا نزیکە تەشریفی بگاتە جێ ڕێک خستنی درۆم لەدڵدا نەما. گوتم من بەهیچ شتێک کە درۆی تیابێ قورتار نابم لەدەست پێغەمبەر (د) بەتەواوی عەزمم کرد هیچ درۆ نەکەم چلۆن ڕاستە وا بلێم.

ئنجا وەکوو تەشریفی گەیشتەوە مەدینە. عادەتیشی وابوو لەهەر سەفەرێک تەشریفی بهاتایەوە. پێشدان دەچووە مزگەوت دوو ڕکعەت نوێژی دەکرد ئنجا بۆ خەڵکی دادەنیشت وەکوو سەلامی نوێژی دایەوە دانیشت. دواکەوتووەکانی ئەنصاری لەغەزا. کە دوو ڕوویی

و سستی ئیمان لەغەزای تەبووکی پاشی خستبوون. هەشتاو ئەمەندە کەسبوون لەگەڵ
پاش کەوتووەکانی عەرەبی بەدەوی لەغیفارو غەیری ئەوان کە هەشتاو دوو کەس بوون و
لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵ عبداللەی کوری ئوبەی کە زۆربوون. بۆ پۆزش خواستنەوەی
(اعتذار) هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) پۆزشیان دەخواستەوە. پێغەمبەریش لەسەر ئەوەی
کە عوزریان دەخواستەوە لەبەر بەزەیی و پێ هاتنەوەو میهرەبانی لەگەڵیان بوو. وە دوعای
لێ بوردنی بۆ کردن. وە لەسەر ئەو نیەتەی هەشیان بوو لەدەروونی خۆیان لەم پاش کەوتنە
حەوالەی خودای کردن. کەعب گوتی لەپاش چوونی دوو ڕوو منافقەکانی کە لەغەزا پاش
کەوتبوون. منیش بۆ خدمەتی چووم. وەکوو سەلامم لێ کرد بە تووڕەیی هەندەک گرژی‌یەو:
(پاشان فەرمووی) وەرە منیش ووردە ووردە ڕۆیشتم هەتا چووم لەپێش دەستی دانیشتم.
پێغەمبەر (د) ڕووی لێ وەرگێرام. کەعب گوتی ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی ڕووم لێ
وەردەگێری. واللە لەبەر دووڕوویی پاش نەکەوتووم. وە هیچ گومانم نەبووە لەدین و
وەرنەگەڕاوم. فەرمووی بۆچی لەغەزا پاش کەوتی ئەدی ووشتری سواریت نەکری بوو. پێم
گوت بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا کڕیبووم، بەڵام واللە ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر
دابنیشتبومایە لای غەیری تۆ لەئەهلی دونیا. بەڕاستی منت دەدیت بە قسە ڕەوانی خۆم
و هێزی گفتوگۆی خۆم نەجاتی خۆم بدەم لەهەر خرابەیێکی کە پێمەوە لکاندرابێ. بەڵام
واللە دەزانم. با ئیمرۆ من درۆیێکیشت لا بکەم و تۆیش بەگوێرەی ئەوەی کە دیارە لێم
خۆش بی. بەڵام نزیکە خودا ڕقی تۆم لێ بکاتەوەو درۆیەکەی منت پێ بلێ. وە ئەگەر
جلونێکیش ڕاستە قسەکانت. وا پێ بلێم. با ڕقیشت بێتەوە بەڵام بەڕاستی ڕجای
عەفووی لێ بوردنی خودام هەیە. نا بەحەقی خودا هیچ پاکانەو عوزرم نەبوو لەپاش
کەوتنم. نا واللە لەهیچ کاتێک بەهێزترو ئامادەتر نەبوومە لەو کاتەی کە لەتۆ پاش کەوتم
پێغەمبەر (د) فەرمووی. ئەما ئەمەت بەڕاستی گوت فەرمووی ئینجا هەلستا. چەند
کەسانێک لەبەنی سەلەمە. لێم بلندبوون کەوتنە شوێنم گوتیان واللە تائێستا ئێمە نەمان
زانیوە تۆ تووشی گوناهێک هاتبی. بەڕاستیش هیچ دەستەلاتت نەبوو تۆیش پاکانەیەکت
بکردایە لەخدمەت پێغەمبەر (د) وەکوو پاش کەوتوەکانی تر. بۆ گوناهی تۆیش پاڕانەوەی
پێغەمبەر بەس بوو. واللە ئەمەندەیان سەرکۆنەو لۆمەکردم. ویستم بۆ بەدرۆخستنەوەی خۆم
بچمەوە لای پێغەمبەر (د) پاشان پێم گوتن ئەدی هیچ کەسێکی تر وەکوو من تووشی ئەم

گوناهە هاتووە. گوتیان بەلێ دوو پیاوی تریش پاش کەوتوون وەکو تۆیش هیچ پاکانەیان نەکرد وەکوو تۆیش بەوانی گوت هەلستن لێرە چاوەڕێی فەرمانی خودا بکەن دەرحەق بەخۆتان. لێم پرسین. ئەمانە کێن. گوتیان یەکی‌یان مورادەی کوڕی ڕەبیعی عەمریە. ئەویتریان هیلالی کوڕی ئومیەی واقفیە. ئەم دووپیاوە باشەیان پێ گوتم کە ئامادەی غەزای بەدر بوون. وە خەلکی بەگوێی ئەوانەیان دەکرد لەشتی چاکە. منیش ڕۆیشتم وەکوو قسەی ئەم دوانەیان بۆ کردم پێغەمبەریش (د) فەرمانی دابوو هیچ کەس قسە لەگەلّ ئەم سێ کەسە نەکا زیاد لەهەموو ئەوانەی پاش کەوتبوون. عالەم خۆیان لەمە دوور دەخستنەوە ڕقی‌یان لێمان بۆوە. هەتا دەرحەق بەعارد بەغەلەت چووبووم دەمگوت ئەم عاردە ئەو عاردە نی‌یە کە پێشان لەسەربووم دەوامان کرد لەم غەم و تەنگاوەیە بەنجا شەو. ئەما هەوالەکانم مورادەو هیلال. لەخانووی خۆیان دانیشتن نەجوولان بۆ هیچ لایێک. کارو پیشەیان هەر گریان بوو وە ئەما من خۆم دەهاتمە دەرێ وە بۆ نوێژیش ئامادە دەبووم لەگەلّ موسولمانان. وە لەکووچەو کۆلان و بازاڕ دەگەڕام هیچ کەسیش قسەی لەگەلّ نەدەکردم وە دەیشهاتمە خدمەت پێغەمبەر (د) سەلامم لێ دەکرد وەکوو لەپاش نوێژ لەئەنجومەنی خۆی دادەنیشت. لەنێو دلّی خۆم خەیالم دەکرد. عەجەبە دەبێ لێوی پیرۆزی جوولابێتەوە بە وەلام دانەوەی سەلامی من یان نەجوولابێتەوە. لەپاشان لەنزیک پێغەمبەر (د) نوێژم دەکرد. بەدزی تەماشام دەکرد دەم دیت وەکو من خەریکی نوێژدەبووم تەماشای دەکردم وەکو من ئاوڕم لەئەو دەداوە ڕووی لەمن وەردەگێرا. هەتا لەبەر ڕێژەی بێزاری خەلک لەخۆم. ڕۆیشتم هەتا بەسەر شوورەی باغی ئەبی قەتادەی حەرثی کوڕی ڕەبعی ئەنصاری ئامۆزای خۆم کەوتم چونکی ئەو خۆشەویست ترین خەلکان بو لای من.. سەلامم لێ کرد وەلامی سەلامی نەدامەوە منیش پێم گوت ئەی ئەبو قەتادە تووخودا ئایا تۆ دەزانی کەمن خوداو پێغەمبەری خودام خۆش دەوێ هیچ قسەیٔ نەکرد. دووبارە ئەم قسەم لێ دووبارەکردەوە گوتی خوداو پێغەمبەری خودا زاناترن. هەردووچاوم لەفرمێسک هەلڕژان. بەری خۆم لێ وەگێڕاو بەڕێگای خۆمدا هاتمەوە. هەتا لەشوورەی باغ ئاوابووم. کاتێک من لەبازاڕی مەدینە دەڕۆیشتم فەلاحێک لەفەلاحەکانی شام لەوانەی خواردنیان بۆ فرۆشتن دەهینا مەدینە گوتی کێ کەعبی کوڕی مالکم نیشان دەدا. خەلکیش بەئیشارە منیا نیشاندا. هاتەلام کاغەزێکی پاشای غەسانی نیشاندام لەپارچە خامەکێک نووسرابوو

بیسـتـوومـه صـاحـبی تۆ تۆی جـهفـاو ئەزیەت داوه. خـودایش تۆی وا ئـیـجـاد نهکـردووه لەجـێـگای بەزیللەت و مل کەچی دانیشی. یاخۆ مـاف و حـقوقت بفـهوتێنێ. (واتا لهتۆ ناوهشێتەوه لەم تەرزه جێگایه دانیشی) ئنجا وهره لای ئێمه تۆ دەلاوێنینەوه. پارێزگاری مافی تۆ دەکەین. وەکوو کاغەزەکەم خوێندەوه. گوتم ئەوەش بەلاییێکی تره بەسەرەم هات. «دانەری ئەم پەرتووکه دەلێ: چونکی لەبەر دەوامی چاوەڕێ کردنی حوکمی خودا دەرحەق بەخۆی بەبێ ئەنجام بوو نزیک بوو بەکاغەزەکه دڵی بگۆڕێ. بۆیێ لای ابن ئەبی شەیبه گوتیتی **(قد طمع في أهل الكفر)**. پاشان بۆلای تەندوورێک چووم کاغەزەکەم فڕەدا نێو ئاگر. چل شەو لەم پەنجا شەوه ڕۆیی. دیتم ناردراوێک کە ناوی (خوزەیمەی کوری ثابت) بوو. لەلایەن پێغەمبەرەوه هاتەلام گوتی پێغەمبەر (د) فەرمانی دا. خۆی لەژنی خۆی دووربخا. کەعب گوتی طەلاقی بدەم نێردراوەکه گوتی (نا) نزیکی مەبە. عەینی ئەو ئەسپاردەدەی بۆ دوو هاوەڵەکەی تریشی ناردبوو.

منیش بەئافرەتەکەی خۆم گوت. بچۆوه ماڵی باوکت هەتا خودا لەم خصوصه حوکمێک دەفەرموی. کەعب گوتی پاشان خێزانی هیلالی کوری ئومەیه کە خەولەی کچی عاص بوو هاتە خدمەت پێغەمبەر (د). دیاره ئەی پێغەمبەری خودا. بەڕاستی هیلالی کوری ئومەیه ئیختیارێکی بێ تاقەت و فەوتاوه. هیچ خزمەتکاریشی نی‌یه تۆ پێت ناخۆشه من خدمەتی بکەم. فەرمووی (نا) بەلام نزیکت نەبی. خەوله گوتی ناو الله هێزی جوولانەوەی شتی وای نەماوه بەتایبەتی لەوکاتەوه تووشی ئەم کارەسەاتی پاش کەوتن بووه لەجهاد. شەوو ڕۆژ کارو پیشەی هەر گریانه. پاشان کەعب گوتی ماڵی خۆشمان بەمنیان گوت ئەگەر تۆش ئیزنت بخواستبایەوه لە پێغەمبەر (د) خێزانی تۆیشی ئیزن بدایه خزمەتت بکا هەروەکوو خێزانی هیلالی کوڕی ئومەیەی ئیزندا گوتم والله ئەم ئیزن خواسنەوەیه ناکەم. چونکی نازانم ئەگەر ئیزنی لێ بخوازمەوه. پێغەمبەر (د) چه وەلامێکم دەداتەوه. چونکی من وەکوو هیلال پیرنیم. بەهێزو تاقەتم. ئنجا لەپاش ئەمەش. دەشەوی تریش خۆم ڕاگرت هەتا بوو بە پەنجا شەو لەوکاتەوه کە پێغەمبەر (د) فەرمانی دابو کەکەس قسەمان لەگەڵ نەکا. پاشان نوێژی سبەینەی کە شەوی پەنجای لێ تەواو بو لەسەربانی خانوێک لەخانوەکانماندا دانیشتبووم بەدڵێکی زۆر تەنگ هەروەکوو خودا دەفەرموی **(حتى إذا ضاقت عليهُم الارضُ بما رَحُبَتْ)** گوێم لەدەنگی حەزرەتی

ـبو بەکر بوو لەسەر کێوی (سەلع) بەدەنگێکی بەرز بانگی دەکرد ئەی کەعبی کوڕی ـ نک موژدەت لێ بێ خودا تۆبەی قبوول کردی. منیش بۆ سوپاس و شوکر سەرم لەسەر ـ رد دانا سەجدەی شوکرم برد. زانیم کە خودا غەمی نەهێشت. پێغەمبەریش (د) خەبەری ـعالەمدا کە خودا تۆبەی کەعب و هیلال و مورارەی قبوول کرد وەکوو نوێژی سبەینەی کرد ـێتر خەلکی موژدەی قبوولی تۆبەیان بەئێمە دەدا وە چەند موژدە دەرێکیش بۆلای ـ وەلەکانم چوون زوبەیری کوڕی عەوامیش بەسواری بەغار بۆ موژدە دەهاتەلام. حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمیشیان ناردە سەر کێو بۆ بانگ ڕاهێشتن. موژدەی دەنگەکەم لە موژدەی سوارەکە زووتر پێ گەیشت. پاشان حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی هاتە لام کە بەدەنگی خۆی موژدەی پێ دابووم جلکی خۆم لەبەر خۆم دارنی پێم دا. واللە لەم دوو جلکەش زیاتر هیچ جلکەکی دیکەم نەبوو ئەو ڕۆژە. دوو جلکم بە ئەمانەت خواستەوە. ڕۆیشتم بۆلای پێغەمبەر (د) خەلکی پۆل پۆل بۆ پیرۆزبایی تۆبە دەهاتنە لام پێیان دەگوتم پیرۆزبایی و تەبریکت دەکەین کە خودا تۆبەی لێ قبوول کردی. کەعب گوتی ئیتر هەر بەم تەرزە ڕۆیشتم هەتا چوومە ناو مزگەوت. دیتم پێغەمبەر (د) تەشریفی دانیشتبوو خەلکیش لەدەورەی بوون طەلحەی کوری عبیداللە کە یەکێک بوو لە عەشرەی موبەشەرە بەپیرمەوە هات دەستی لەملی کردم و پیرۆزبایی لێ کردم. واللە پیاوێکی تر لەموهاجیر هەلنەستا ئینجا ئەم چاکەی طەلحە قەت لەبیرناکەم. ئنجا کەعب گوتی وەکوو سەلامم کرد لە پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕوێک کە لەبەر کەیف خۆشی بریقەی دەدا موژدەت لێ بی بەباشترینی هەر ڕۆژێکت کە لەسەرت ڕەت بووە لەو ڕۆژەوە کە دایکت تۆی بووە. کەعب گوتی بەبەڕێزیم گوت ئەم مژدەیە ئەی پێغەمبەری خودا لەلایەن خۆتەوەیە یا لەلایەن خودا. فەرمووی لەلای خوداوەیە. ئنجا ئەحوالی پێغەمبەر (د) وابوو وەکوو کەیف خۆش ببوایە ڕوویی پیرۆزی گوایا پارچەیەکە لەمانگ بەوە دەمانزانی کەیف خۆشە. وەکوو لەپێش هەردوو دەستی دانیشتم پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا تۆبەی من ئەوەیە دەرچوونم لەهەموو مالی خۆم بەخێرو صەدەقە بۆ خوداو پێغەمبەری خودا. (واتا لەبەرامبەر ئەم نیعمەتە گەورەیە کە خودا تۆبەی لەمن قبوول کرد حەزدەکەم مالی من هەمووی صەدەقە بێ). فەرمووی ئاگات لەهەندێ مالی خۆت هەبێ باشترە بۆ تۆ. پێم گوت ئەوی تری کە لەتالانی خەیبەرم پێ براوە بۆخۆم ئاگام لێ دەبی. پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی

خودای گەورە بەهۆی درۆ نەکردنم و قسەی ڕاست نەبێ هیچ قسەیەک نەکەم هەتا حەیت ماوە. ئنجا سوێند بەخودا لەو ڕۆژەوە کە قسەی ڕاستم بۆ پێغەمبەر کردووە. پێ نازانم یەکێک لەموسولمانان کە لەقسەی ڕاست خودا نیعمەتی پێ دابێ باشترین لەو نیعمەتی کە بەمنی داوە. وە بەئەنقەست من درۆم نەکردووە لەو ڕۆژەوە ئەم قسە ڕاستەم بۆ پێغەمبەر کردووە (د). هەتا ئیمرۆ وە لەمە پاشیش ڕجاو تکام وایە کە خودا لەدرۆ بم پارێزی هەتا لەدونیا ماوم. وە خودای گەورەش. ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ بۆ پێغەمبەر (د). دەرحەق بەقبوولی تۆبەی ئێمەو هاوڕێیەتی خێر خوازان و ئەوانەی صەدەقان دەکەن. (**لَقَدْ تاب اللّهُ على النبيِّ والمهاجرينَ والأنصارِ الذينَ اتَّبعوهُ في ساعَةِ العُسْرَةِ مِنْ بعدِ ما كادَ يَزِيغُ قلوبُ فريقٍ مِنهُمْ ثمَّ تابَ عليهِمْ اِنَّهُ بِهِمْ رؤوفٌ رحِيم. وعلى الثَّلثةِ الذينَ خُلِّفوا حتَّى اِذا ضاقَتْ عليهِمُ الأرضُ بما رَحُبَتْ وضاقَتْ عليهِمْ انفسهم وظَنوا أَن لا ملجأَ مِنَ اللّهِ اِلاّ اَلَيْهِ ثمَّ تابَ عليهِمْ ليتوبوا. ان اللّه هوَ التَّوّابُ الرَّحيم. يا ايّها الذينَ آمنوا اتقوا اللّهَ وكونوا مع الصادقينَ**). یەعنی لەهاودلیەتی و صوحبەتی ئەوان کەسانەبن کە ڕاستن لەئیمان و باوەڕی خۆیان لەهاولیەتی دوو ڕوو منافقان مەبەن سوێندم بەخودا لەپاش نیعمەتی هیدایەت کە موسولمان بووم هیچ نیعمەتێکم پێ گەورەتر نی‌یە لەنیعمەت و خۆشی ڕاست گۆتنم لەخدمەت پێغەمبەر (د) بەم تەرزە هیچ درۆیێکم لەخدمەت نەکرد ببێتە هۆی بەهیلاک چوونم وەکوو ئەوانەی بەسەبەب سوێندی بەدرۆ لەوکاتەی کە پاکانەیان دەکرد لەپاش کەوتنیان لەجیهاد بەهیلاک چوون بەم تەرزە ئایەتی‌یان دەرحەق هاتە خوارێ بەفەرموودەی خۆی (**سَيَحلِفونَ باللّهِ لكم اِذا انقلبتُمْ اِلَيهِمْ لِتُعرضوا عنهم فاعرِضوا عنهُمْ اِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمأواهم جهنَّمَ جَزاءاً بما كانوا يكسبونَ. يحلِفونَ لكُمْ لِيُرضوا عَنْهُمْ فأن تَرضَوا فانَّ اللّهَ لايَرضى عنِ القوم الفاسقينَ**). کە هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش بۆ ئەو منافق و دوو ڕوانەی کە دەرحەقی ئەوانە لەگەورەترینی کارەسات و موصیبەتانە. ئنجا کەعبی کوڕی مالک بەقسەکردن لەگەڵ خۆیو هاوەڵەکانی بەراووردی لەنێوان دواکەوتنی خۆیو دواکەوتنی منافقان دەکا لەجهاد کە دەرحەق بەوانیش ئایەت دەربارەی پاش کەوتن لەجهاد هاتوەتە خوارێ. کە ئایەتەکە دەفەرمویێ (**فَرِحَ المخلَّفونَ بِمقعَدِهِمْ خِلافَ رسولِ اللّهِ وكرِهوا ان يجاهِدوا بأموالِهِمْ وَأنفُسِهِمْ في سَبيل الله وَقالوا لاتنفِروا في الحَرِّ**). حاصلی فەرقەکەی لەتەفسیری پاش کەوتنی هەردوو چین و

فیرقه. گوتیتی مەبەست لەپاش کەوتنی منافقان کە دەفەرموێ (فرِحَ المخلَّفونَ) ..هتد. پاش کەوتنە لەغەزای تەبووک بۆ حەسانەوەو خۆشی خۆیان لەمەدینە. مەبەستیش لەپاش کەوتنی ئێمە هەر سێمان کە دەفەرموێ (وَعلى الثلاثةِ الذينَ خلفوا...الخ) پاش کەوتنمان بوو لەپاکانەی بەدرۆی منافقان. پێغەمبەریش (د) ئێمەی هێشتەوە فەرمووی چاوەڕێی حوکمی خودا بکەن دەرحەق بەخۆتان لەتەفسیری ئەم ئایەتانە بیری وا ڕۆیشتووە.

١٠٤٨: عَنْ اَبي بَكْرَةَ (ض) لَنْ يُفلحَ قَوْمٌ وَلَّوا اَمْرَهُمْ اِمْرَاَةً.

**تەرجەمە**

١٠٤٨: دەگێڕنەوە لەئەبی بەکرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی بەڕاستی خودا کەلکی بەمن گەیاند بە کلمەیێک کە بیستم لە پێغەمبەر (د) لەکوشتاری (جمل) کە لەبەینی حەزرەتی عەلی و حەزرەتی عائشە ڕووی دا کە نزیکیش بوو ببمە لای حەزرەتی عائشە. گوتی وەکوو خەبەر گەیشتە پێغەمبەر (د) کە خەڵکی وولاتی فارس کچی کیسرایان کردووتە پاشا لەجێی باوکی چونکی کوری نەبوو فەرمووی نەجاتی نابێ قەومێک کە بو کاروباری بەڕێوەبردنی حکومەت و مەملەکەتیان ژنێک دابنێن بەشاژن یا (مەلیکە).

## مَرَضُ النبيَّ صلى الله تعالى عليه وسلم ووفاته

### نەساغی پێغەمبەرو وەفاتی دروودی خوای لەسەربی

**١٠٤٩: عَنْ عائِشَةَ (ض) قالَتْ كُنْتُ اَسمَعُ اَنَّهُ لايموتُ نبيٌّ حتَّى يُخيَّر بيْن الدنيا وَالآخِرَةِ فسَمِعْتُ النبيَّ صلى الله تعالى عليه وسلم يقولُ في مَرَضِهِ الذي ماتَ فيهِ وَاَخَذَتْهُ بُحَّةٌ يَقولُ. مَعَ الذَينَ اَنعَمَ اللّهُ عليهِمْ الايَةَ فَظَنَنْتُ اَنَّهُ خُيِّرَ.**

**تەرجەمە**

١٠٤٩: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە (خ.ل) گوتی هەرجارە گوێم لێ دەبوو لەپێغەمبەر (د) دەی فەرموو هیچ پێغەمبەرێک نامری هەتا سەرپشک دەکرێ لەبەینی مانەوەی لەدونیاو بارکردن بۆ ئاخیرەت - کەمردنە- پاشان گوێم لێ بوو لە پێغەمبەر (د) دەی فەرموو لەو ناساغی پێ وەفاتی کرد دەنگیشی کەرخ بووبوو (مع الذين انعم الله

علیـهم...) واتا لەگەڵ ئەو کەسـانەی کە خـودا چاکەی لەگەڵ کردوونە..هتـد) زانیـم کە پێغەمبەریش (د) سەرپشک کرا لەبەینی مانەوە لە دونیاو کۆچ کردن بۆ ئاخیرەت.

١٠٥٠: عَنْ عـائِشَةَ (ض) اَنَّهُ لَمْ يُقبَضْ نبيٌّ قَطُّ حتّى يرى مقعَدَهُ مِنَ الجنَّةِ ثمّ يُحيّا أو يُخيَّرُ ثمّ قالَ اللهُمَّ في الرَّفيقِ الأعلى.

## تەرجەمە

١٠٥٠: دەگێرنەوە لەحەزرەتی عائشە (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) هەرجارە لەحاڵی صحەتی خۆی دەی فەرموو وەرناگیریّ رووحی هیچ پێغەمبەرێک بەهیچ جۆرێک هەتا جێگای خۆی لەبەهەشت دەبینی. پاشان کاری خۆی تەسلیم بەخۆی دەکریّ. یاخۆ فەرمووتی لەسەر گێرانەوەیەکی تر. پاشان سەرپشک دەکریّ و اختیار دەکریّ ئنجا وەکو پێغەمبەریش ناساغیەکەی زۆر گران بوو هاتە سەر وەفات. سەری پیرۆزی لەسەر رانی من بوو کەوتە بێخودی. پاشان وەکوو بەهۆش هاتەوە تەماشای ساپیتەی (سقف)ی خانووی کرد فەرمووی (اللهُمَّ في الرَّفيق الأعلى) یەعنی یارەبی هاوەڵیەتی و رەفیقایەتی پێغەمبەران و جبریل و میکائیل و اسرافیلم پێ ببەخشی لەرەفیقی أعلى واتا لە باڵاترینی جێگایان. بەم فەرموودەیەی تێ گەیشتم ئێمە هەڵ نابژێریّ. وە ئیتر جیرانەتیمان ناکا. وە ئەم حەدیثەیش کەهەرجارە بەساغی دەی فەرموو ناسیمەوە کە حەدیثی خۆیەتی.

١٠٥١: عَنْ عائِشَةَ (ض) اللهُمَّ اغفِرْ لي وارحَمْني والحِقني بالرَّفيق.

## تەرجەمە

١٠٥١: دەگێرنەوە لەحەزرەتی عائشە (خ.ل) گوتی لەپێش وفات پێغەمبەر (د) پاڵی بەپشتی پیرۆزی خۆی دابوو گوێم دایێ دەی فەرموو (اللهم اغفر لي) واتا خوایە لێم خۆشبە رەحمم پێ بکە. بمگەینە باڵاترینی جێگایان لەگەڵ پێغەمبەران و ئەو مەلائکانەی کە لەتۆ نزیکن.

١٠٥٢: عَنْ عـائِشَـةَ (ض) لا الهَ الاّ اللّهُ. ان للمـوتِ سَكراتٍ ثمَّ نَصَبَ يَدَهُ فَجعَلَ يقولُ في الرَّفيقِ الأعلى حتّى قُبِضَ وَمالَتْ يَدُهُ.

## تەرجەمە

١٠٥٢: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە (خ.ل) گوتی بەڕاستی لەنیعمەتانی خودایە دەرحەق بەمن کە پێغەمبەر (د) وەفاتی فەرموو لەخانووی من. وە لەڕۆژی نۆبەتی من. وە لەبەینی (سەحری من و نەحری من) واتا سەری پیرۆزی وەکوو وەفاتی کردلەبەینی سیپەلکو گەردەنی من بوو وە لەگێڕانەوەیەکی تر گوتیتی (بيْنَ حاقِنتي وذاقنتي) یەعنی لەبەینی قۆرتی هەوکم و چەنەگەم بوو وە بەڕاستی خودای گەورە ئاوی دەمی من و ئاوی دەمی ئەو لەیەک سیواک کۆکردەوە. بەم شێوەیە عبدالرحمن ی برام کوڕی ئەبوو بەکر هاتەلام سیواکی بەدەستەوە بوو پێغەمبەریش پالی بەمن دابوو دیتم تەماشای سیواکەکە دەکا زانیم مەیلی لەگەڵ سیواک هەیە. پێم گوت سیواکەکەت بۆ وەرگرم بەئیشارە فەرمووی (ئا). منیش سیواکم لەعبدالرحمن وەرگرت و دامێ. بەموناسەبەی سەختی ناساغیەکەی سیواکەکەی پێ توند بوو منیش پێم گوت بۆت نەرم بکەمەوە. بەئیشارەی سەر فەرمووی (ئا) منیش سیواکەکەم لەنێو دەمی خۆمناو جویم هەتا نەرم بوو. ئنجا بەسەر ددانی پیرۆزی پێغەمبەرم داهینا. دێمکە ئاوێکیش لەپێش دەستی بوو هەر جارە دەستی لەنێو ئاوەکە دەنا ڕوویی پیرۆزی خۆی پێ دەستریەوە. دەی فەرموو لا اله الا الله بەڕاستی بۆ مردن چەند شیدەتو سەختی هەیە. پاشان دەستی پیرۆزی بەرەو ئاسمان چەقاند. ئیتر لەسەر یەکتری هەر فەرمووی (اللهم في الرفيق الاعلى) هەتا رووحی پیرۆزی تەسلیم فەرموو دەستەکانیشی مەیلی عەردیان کرد. بەنیشانەی لەسەر بارکردنی بۆ لای خودای خۆی لەبەرزترینی پلەکانی بەرزی (اعلى عليين).

**١٠٥٣: عَنْ عائِشَةَ (ض) اَلَمْ انهكُمْ اَنْ تَلُدّوني. لايبقى اَحَدٌ في البْيتِ اِلاّ لَدّوا انا انظُرُ اِلاّ العَبّاسَ فانَّهُ لَمْ يَشهَدْكُمْ.**

## تەرجەمە

١٠٥٣: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە (خ.ل) گوتی نەختێ زەیت و عودی هندی بەدەرمان لەلایەکی دەمی پیرۆزی پێغەمبەری دانا (د) چونکی واتێ گەیشتین نەخۆشیەکەی (ذات الجنب)ە. ئەوەش لەکاتی بێ ئاگایی خۆی بوو.

پێشتریش نەهی فەرموو بوو لەدەرمان گوتبووی لەناساغی دەرمان بەمن مەدەن.

ئێمەش گوتمان ئەم نەهیەی بۆیێ فەرمووە چونکی دائما نەساغ دەرمانی ڕک لێ دەبتەوە.
پاشان وەکوو بەهۆش هاتەوە فەرمووی ئەدی من بەئێوەم نەگوت بوو دەرمان بەمن مەدەن.
ئێمەیش پێمان گوت مەبەست و مەقصەدت ئەوەیە دەرمانت پێ ناخۆشە. هەروەکوو هەر
نەساغێک. فەرمووی مادام ئێوە لەئامادەبوونی من و تەماشادەکەم دەرمانتان بەمن دا
جەزاتان ئەمەیە جگە لە عەباس هەمووتان بچۆنە دەرێ لەخانوو چونکی ئەوەی کە
ڕاستەوخۆ دەرمانی پێداوم لەبەر ئەم کارە دەبی بڕوا. ئەوی دەرمانیشی پێ نەدام لەبەر
تەرکی نەهی لەو شتی کەمن نەهیم لێ کردووە. بەلاّم عەباس لێرە نەبووە کە دەرمان بەمن
دراوە.

**١٠٥٤: عَنْ اَنَسٍ (ض) قالَ لَمـا ثَقُلَ النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم جَعَلَ يتَغَشّاهُ. فقالَتْ فاطِمةُ وا كرَباهُ أو ياكَرْبَ اَباهُ. فقالَ لها لَيْسَ على ابيكَ كَرْبٌ بَعْدَ اليَوْمِ.**

### تەرجەمە

١٠٥٤: دەگێرنەوە لەئەنەس (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) نەساغیەکەی گران بوو ئازار
دای پۆشی. حەزرەتی فاطمە گوتی ئای بۆ ئێش و ئازاری خۆم. یاخۆ گوتی بۆ ئێش و
ئازاری باوکی خۆم پێغەمبەر (د) پێ‌ی گوت لەپاش ئیمڕۆ هیچ ئێش و ئازار نەما لەسەر
باوکت. حەزرەتی فاطمەیش شەش مانگ لەپاش وەفاتی باوکی ژیا لەو ماوەیەشدا پێ
نەکەنی. حەزرەتی عائشە فەرمووی پێغەمبەر (د) لەتەمەنی شەستو سێ سالّی وەفاتی
کرد. وەکوو پێغەمبەر (د) شرایەوە. حەزرەتی فاطمە فەرموی ئەی ئەنەس دلّتان حەسایەوە
پێغەمبەری خوداتان خستە ژێر خاک و خۆلّ خاکی بەسەردا دەکەن بەشیعری فەرمووی:

**إغبَرَّ آفاقُ السَّماءِ وكُوِّرَت * شمس النهارِ واظلَمَ العصرانِ**[1]
**والارضُ بَعْدَ النبيِّ كَئيبَةٌ * اسفاً عَلَيْهِ كثيرةُ الرَّجَفانِ**
**فَلْنَبْكِهِ شرق البِلادِ وغربُها * ولتَبْكِهِ مُضَرٌ وَكُلُّ يَمانِ.**

---

(١) العصران/ زەمانی شەوو ڕۆژ.

### تەرجەمە

ئەوڕۆژە هەرکەسی بهاتایە مەدینە لەدووری شار لەهەموو خانوێک و کۆچەو کۆلانێک ئەمەدینە گوێی لەهاوارو گریان و دادو ڕۆ ڕۆ دەبوو وەکوو هاوار هاواری حەجاج لەدەورەی بەیت حەقیشیان بووە ئەوانیش و عالەمی پاش ئەوانیش هەتا قیامەت.

# كتاب تفسير القرآن
# سورة الفاتحة

## باسی تەفسیری قورئان
## سورەتی فاتحە

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

**١٠٥٥: عَنْ أَبي سعيدِ المعلّى (ض) أَلَمْ يقلِ اللّهُ استجيبوا لِلّهِ وللرّسولِ إذا دعاكُمْ. ثمَّ قالَ لأعلّمَنّكَ سورةً هِيَ أعظَمُ السّوَرِ في القرآنِ قبْلَ أن تخرُجَ مِن المسجدِ الحمدُ لِلّهِ ربِّ العالمينَ هِيَ السّبْعُ المثاني والقرآنُ العظيمُ الّذي أوتيتُهُ.**

### تەرجەمە

١٠٥٥: دەگێرنەوە لەرافع ئەبو سەعید کوڕی موعەللا (خ.ل) گوتی نوێژم دەکرد لە مزگەوت پێغەمبەر (د) بانگی کردم وەلامم نەداوە. پاشان پێم گوت کاتی بانگت کردم نوێژم دەکرد بۆیێ وەلامم نەدایەوە. فەرمووی ئەدی خودا نەی فەرمووە. استجیبوا لله وللرسول اذا دعاكم واتا: وەلامی خوداو پێغەمبەری خودا.بدەنەوە ئەگەر بانگی‌یان کردن. پاشان پێی گوتم بەتەئکید سورەتێکت فێردەکەم گەورەترینی سورەتەکانی قورئان بێ. لەپێش دەرچوونت لەمزگەوت. پاشان دەستی گرتم نزیک بوو تەشریفی لەمزگەوت دەربچێ. بەبەرێزیم گوت ئەدی نەت فەرموو سوورەتێکت پێ دەلێم لەگەورەترینی سوورەتەکانی قورئان؟. فەرمووی الحمد لله رب العالمين ئەوە سبع المثانی‌یە. (یەعنی حەوت ئایەتەو مەثانی‌یە چونکی دائما تەثنیەو دووبارە دەکرێتەوە شەوو ڕۆژ لەهەموو نوێژان لەهەموو ڕکعەتان). ئەو قورئانە گەورەیەش کە بەمن کەرەم کراوەو بەخشراوە.

(ش): ئەم حەدیثە کراوەتە بەلگەو دەلیل کە ولامدانەوەی پێغەمبەر (د) واجبە با

لەنوێژیش بێ. کۆمەڵێکیش لەئەصحابی شافعی و ئەوانی تریش ووتوویانە نوێژیش بەتاڵ نابێ بە وەڵامدانەوەی پێغەمبەر (د) چونکی وەکوو ئەم قسەیە کە لەنوێژ لەگەڵی دەکرێ دەگوترێ (السلام عليكَ ايها النبيُّ ورحمة اللّه) هەندێکیش لەشافعیەکان گوتویانە جوابدانەوەی پێغەمبەر (د) واجبە با نوێژەکەیشت بەتاڵ بێ بەڵام قسەی پێشوو بەهێزترە.

## سورة البقرة
## سورەتی بەقەرە

١٠٥٦: عَنْ عبدالله ابن مسعود (ض) اَن تَجعَلَ لِلّهِ نِداً وَهوَ خَلَقَكَ. واَن تقتُلَ وَلَدَكَ تخافُ ان يطعَمَ مَعَكَ وَان تُزانيَ حليلةَ جارِكَ.

### تەرجەمە

١٠٥٦: فەرموودەی خودا (فلا تجعَلوا لِلّه اَنداداً وَانتم تعلمونَ) دەگێرنەوە لەعبدالله کوڕی مەسعود (خ.ل) گوتی پرسیم لە پێغەمبەر (د) لای خودا کامە گوناهێک لەهەموو گوناهان گەورەترە فەرمووی گەورەترینی گوناهان ئەمەیە. کە وێنەو نەظیرێکی بۆ خودا پەیدابکەی ئەو خودایەی کە تۆی پەیداکردووە. بەبەڕێزیم گوت لەپاش ئەمە چی گەوردیە فەرمووی منالی خۆت بکوژی لەوە بترسێی کە خواردنت لەگەڵ بخوا. بەبەرێزیم گوت پاشان چی گەورەیە. فەرمووی (زنا) لەگەڵ ژنی جیرانت بکەی. لەم حەدیثە وا دەزاندرێ بۆ گوناهی گەورە مەراتب هەیە کەوایە بۆ گوناهی بچووکیش هەیە.

١٠٥٧: عَنْ سعيدِ ابنِ زَيْدٍ (ض) الكَمأَةُ مِنَ المَنّ وَماؤها شِفاءٌ لِلْعَيْنِ.
فەرموودەی خودا: (وَظلَّلنا عليكم الغمامَ وَانزَلْنا عليكمُ المَنَّ والسلّوى).

### تەرجەمە

١٠٥٧: دەگێرنەوە لەسەعیدی کوڕی زەید کە لەو دە کەسانەیە موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە (العشرة المبشّرة) (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی دۆمبەڵان لەم بارەوە کە بەبێ چاندن و سەربەخۆو بێ ماندووبوون لەژێر عارد دەڕوێ و پەیدادەبی. لەگەزۆیە بەم

تەرزە ئەویش بێ ماندووبوون ئەکەوێتە سەر پەلکی داری مازوو شتی تریش. وە ئاوەکەیشی دەرمانە بۆ چاو. بەڵام بەم تەرزە کلو تووتیای پێ پەروەردە بکەی نەک بەتەنیا. چونکە بەتەنیا چاو ئەزیەت دەدا.

## فەرموودەی خودا
## (وإذ قلنا ادخلوا هذه القريَة)

**١٠٥٨: عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ض) قيلَ لبني اسرائيلَ ادْخلوا البابَ سُجَّداً. وقولو حِطَّةٌ فَدَخلوا يزحفونَ على إستاهِهِمْ فَبدَّلوا وَقالوا حِنطَةٌ حَبَّةٌ في شعرَة.**

### تەرجەمە

١٠٥٨: دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو بەنی ئیسرائیل لەڕێ بزرکردنی بیابان (تیه) دەرچوون لەپاش چل ساڵ لەگەڵ یوشەعی کوڕی نون سەلامی خوای لێ بی وە بیت المقدسیشی بۆ فەتح کردن هێوارەی هەینی وە کەمیکیش ڕۆژی بۆ ڕاگرتن هەتا بتوانن قودس بگرن فەرمانیان پێ کرا بچنە ناو دەرگەی شار بەمل کەچی و سەجدەی سوپاس و شوکر بۆ خودا لەسەر چاکەی گرتنی قودس کەبوە مەملەکەتی خۆیان وە نەجاتیان لە ڕێ بزرکردنی بیابان. و داوای لێ بوردن بکەن لەخودا بۆ گوناهەکانتان. ئەوانیش چوونە ناو شار لەسەر لاقونیان دەخشین سەجدەیان گۆڕیەوە بەخشین لەسەر عارد وە لەفظی **(حِطَّةٌ)**یشیان وەرگێڕا سەر زمانی نەبط کە بەمەعنا (حنطه)یە واتای (گەنم). گوتیان مەبەست لە **(حِطَّةٌ)** گەنمی (حومەیرایە) بەگاڵتە پێ کردن.

(ش): لەبەر تۆڵەی ئەم گاڵتەیان خودا دەرحەق بەوان ئەم ئایەتەی نارده خوارێ **(فأنزَلنا على الذينَ ظَلموا رِجْزاً مِن السَّماءِ بما كانوا يفسقون)**. مەبەست لە (رجز) طاعونە. گوتراوە لەماوەی یەک سەعات بیست و چوار هەزار کەسیان مردن.

## (فەرموودەی خودا)
## (ما ننسَخ مِن آيَةٍ أوْ ننسِها نأتِ بخيْرٍ مِنها أو مِثلها)

١٠٥٩: عَنْ ابنِ عبّاس (ض) قالَ قالَ عُمَرُ (ض) أقْرؤُنا أبيٌّ وَأقضانا عليٌّ وإنّا لَنَدَعُ مِن قولِ أبيّ. وَذاكَ أنَّ أُبَيّاً يقولُ لاأدعُ شيئاً سَمِعْتُهُ مِن رسول اللّهِ صلى الله تعالى عليه وسلم. وقَدْ قالَ الله عزَّوَجَلَّ ماننسخُ مِنْ ايَةٍ أو ننسِها.

### تەرجەمە

١٠٥٩: فەقەرەی دووەم حەدیثی مەرفوعە لەنەنەس بەم عبارەتە (أقضى أمَتي عليّ ابن ابي طالب) (خ.ل) دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس (خ.ل) گوتی حەزرەتی عومەر گوتی خوێندەوارترمان بۆ قورئان ئوبەی کوڕی کەعبە. زاناترینیشمان بەحوکم کردن لەبەینی خەڵکی علی کوڕی ئەبی طالبە. بەڵام ئێمە واز دێنین لەقسەی ئوبەی کە دەڵێ تەرک ناکەم هیچ شتێکی بیستبم لە پێغەمبەر (د) کەچی خودا خۆی فەرموویتی (ماننسخُ مِنْ آيَةٍ أو ننسِها). کە دەلالەت دەکا لەسەر هەبوونی نەسخ لەقورئان بەپێچەوانەی فکری ئوبەی کە دەڵێ نەسخ لەقورئان نی‌یە.

## فەرموودەی خودای گەورە
## (وَقالوا اتخَذَ اللهُ وَلَداً سبحانَهُ)

١٠٦٠: عَنْ ابن عباس (ض) قالَ اللّهُ كذَّبني ابنُ آدَمَ. وَلَمْ يكُنْ لَهُ ذلِكَ. وَشتَمَني وَلَمْ يكُنْ لَهُ ذلِكَ. فأمّا تكذيبُهُ إيّايَ فَزَعَمَ أنّي لا أقدِرُ أنْ أعيدَهُ كما كانَ. وَأمّا شتْمُهُ ايّايَ فقوْلُهُ لي وَلَدٌ فسبحاني أن اتخِذَ صاحِبَةً أوْ وَلَداً.

### تەرجەمە

١٠٦٠: دەگێڕنەوە لە عبدالله کوڕی عەباس (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د). بە نەقل لەخودای گەورە کە فەرموویتی هەندێ کوڕەکانی ئادەم نسبەتی درۆیان وەباڵ من دا کە

لایق بەویش نەبووە ئەمن بەدرۆ بخاتەوە. وە جنێـویشی بەمن دا کە بۆ ئەویش نەهاتووە جنێو بەمن بدا. ئەما بەدرۆخستنەوەکەی ئەمەیە واتا (تەکذیبەکەی) واتێ دەگا من ناتوانم جارێکی تر دروستی بکەمەوە لەپاش مردن. کە ئیجادو پەیداکردنی پێشوو پاشووش لای من وەکـوو یەکـە. ئەگـەرچی بەگـوێرەی عـەبد پەیداکـردنی پاشـوو ئاسـانتـرە چونکی شوێنەوارێکی هەیە وەکوو پەیداکردنی پێشوو نی‌یە لەهیـچەوەبێ. ئەما جنێـودانەکەشی بەمن ئەمەیە نسبـەتی مندالـم وەباڵ دەدا کە منیش پاکم لەهەلبژاردنی ژن یان منال بۆخۆم. (چونکی خودای گەورە هەبوونەکەی لەبەر زاتی خۆی واجبەو قەدیمەو لەپێش هەموو شتێکە غـەیری خـۆی لەنەبوونەوە پەیداکـردووە ئنجـا ژن و منداڵ لەئەزەلدا لەکـوێ هەبوو هەتا نسبەتی ئەم کەمی‌یەو جنێوەی وەباڵ بدرێ.

## (فەرموودەی خودای گەورە)
## (قولوا آمنا بالله وما أنزل الينا)

١٠٦١: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لاتُصَـدِّقـوا اَهلَ الكِتـابِ وَلا تكذّبوهُمْ وقـولوا (آمنّا باللّهِ وَما انزلَ الَيْنا).

### تەرجەمە

١٠٦١: دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە (خ.ل) گوتی جولەکە تەوراتیان بەزمانی (عبرانی) دەخوێندەوەو بەزمانی عەرەبیش مەعنایان لێ دەداوە بۆ موسولمانان پاشان پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەهلی تەورات نە بەراستیـان بزانن نە بەدرۆیان بخەنەوە چونکی ئەو خەبەری کە بەئێوە دەدەن ئەگەر احتمالی ڕاستی هەبێ بەدرۆشیـان بخەنەوە (تەکذیبیـان) بکەن یاخۆ درۆبێ بەڕاستی بزانن و تەصدیقیـشیـان بکەن. ئێوە بەهیلاک دەچن. وە بلێن باوەڕمان هەیە بەخوداو بەقورئانیش کە ناردراوەتە خوارێ بۆ ئێمە.

## (تەفسیر)

**فەرموودەی خودا (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ).**

**١٠٦٢: عَن أَبي سعيدٍ (ض) يُدْعَ نوحٌ يَوْمَ القيامَةِ فيقولُ لبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يارِبِّ فيقولُ هَلْ بَلَّغْتَ فيقولُ نَعَمْ. فيُقالُ لامَّتِهِ هَلْ بَلَّغَكُمْ فيقولونَ ما أتانا مِنْ نذيرٍ. فيقولُ مَنْ يشهَدُ لكَ. فيقولُ محمَّدٌ وأمَّتُهُ فيشهدونَ انَّهُ قَدْ بَلَّغَ. ويكونُ الرَّسولُ عليكُمْ شهيداً. فذلِكَ قَوْلُهُ تعالى عزَّوجَلَّ. وكذلِكَ جَعَلْناكُمْ أُمَّةً وسطاً لِتكونوا شهداءَ على الناسِ ويكونَ الرَّسولُ عليكُمْ شهيداً.**

**والوسطُ: العَدْلُ**

## تەرجەمە

١٠٦٢: دەگێڕنەوە لە ئەبو سەعیدی خودری. سەعدی کوڕی مالکی سەنان (خ.ل). پێغەمبەر (د) فەرمووی ڕۆژی قیامەت. بانگی نوح دەکرێ سەلامی خوای لێ بی لەلایەن خودای گەورەوە. نوح سەلامی خوای لێ بی دەڵێ: لبیک و سعدیک (یەعنی لەچاوەڕێی بەجێ گەیاندنی فەرمانت ڕاوەستاوم) ئەی پەیداکەرو بەخێوکەری خۆم. خودا دەفەرموی ئەحکامەکانی منت بەقەومی خۆت ڕاگەیاند: دەڵێ بەڵێ: پاشان بە ئومەتەکەیشی دەگوترێ ئەرێ ئەحکامی شەرعیەی خودای بەئێوە گەیاند. ئومەتەکەی دەڵێن: هیچ پێغەمبەرمان بۆ نەهاتووە. پاشان خودای گەورە ڕاستەوخۆ بەنوح دەڵێ: کێ شاهیدیت بۆ دەدا کە تەبلیغت کردووە. نوح دەڵێ محمدو ئومەت یەعنی ئێوە شاهیدی لەسەر ئومەتان دەدەن. پێغەمبەریش شاهیدی لەسەر ئێوە دەدا. هەروەکوو خودا دەفەرموی (وکذلک جعلناکم... الخ). یەعنی بەم تەرزە ئێوەم گێڕاوە بە ئومەتێکی عادلە لەبو شەهادەت لەسەر بەیانی ئەحوالی ئومەتانی پێشوو. وە پێغەمبەریش لەسەر ئێوە شاهید بێ.

## فەرموودەی خودای گەورە
## (وَمِنْهُمْ مَنْ يقولُ رَبَّنا آتِنا في الدنيا حسنةً)(الاية).

١٠٦٣: عَنْ اَنَسٍ: اللهُمَّ رَبَّنا آتِنا في الدنيا حسنةً وَفي الآخِرَةِ حسنَةً وَقِنا عذابَ النّار.

### تەرجەمە

١٠٦٣: دەگێڕنەوە لە ئەنەس (خ.د). گوتی پێغەمبەر (د) هەرجارە بەم ئایەتە دەپاڕایەوە دەیگوت (اللهُمَّ رَبَّنا ...الخ) یەعنی ئەی خودایا لەدونیا چاکەیێکی وام پێ بدەی کە ڕازی بوونی خۆتو چوونە ناو بەهەشت بگرێتەوە بەبێ ترسی گەورە لە مەوقیف و عەرەصات. (واتە شوێنی ڕاوەستانی خەڵک لەبۆ حساب کردن لەگەڵیان). وە بشم پارێزی لە عەزابی ئاگر. بەئاسان کردنی ئەسبابی سەرکەوتنم لەسەر طاعەتی خۆت. لەدونیاو لادان لەگوناهان.

### (تەفسیر)

## فەرموودەی خودای گەورە
## (لايَسْئَلونَ النّاسَ الحافاً).

١٠٦٤: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لَيْسَ المسْكينُ الذّي تَرُدّهُ التمرَةُ وَالتمرَتانِ ولا اللُّقمَةُ ولا اللُّقمتانِ اِنّما المسكِينُ الذي يتعَفّفُ واقرَؤا اِن شِئتُمْ (يعني: قوله تعالى لايَسْئلونَ الناسَ الحافاً).

### تەرجەمە

١٠٦٤: دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەژار (مسكين) ئەو كەسە نییە كە دانە خورمایێک یا دوو دانە خورما یا پارێک لەخواردن یا دوو پاروو ئەوی بگێڕێتەوە لە دەرۆزە لای خەڵکی چونکی تەوانایە لەسەر پەیداکردنی

خواردنی خۆی بەسەبەب دەرۆزەو سوال کردن. بەڕاستی مسکین و هەژار ئەو کەسەیە پیٚی شەرم بی دەرۆزە بکا پاک بی لەوە خۆی بەکەم بزانی کە دەرۆزە بکا بیشخوێننەوە ئەگەر حەزدەکەن ئایەتی (لایَسْئلون الناسَ....الخ). یەعنی موستەحەق بە صەدەقەو خێر ئەو کەسەیە لەبەر شەرم کردن الحاح ناکا لەدەرۆزە. (یەعنی دەرۆزە ناکەن لەشەرمی خودا).

## سورەتی ال عمران

## فەرموودەی خودا (منْهُ آياتٌ محكمات).

١٠٦٥: عَنْ عائِشَةَ (ض) فاذا رأيْت الذينَ يتّبعونَ ما تشابَهَ مِنْهُ فأولئِكَ الذينَ سَمّى اللّهُ فاحذوروهُمْ.

### تەرجەمە

١٠٦٥: دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) ئەم ئایەتەی (هُوَ الذّي أنزَلَ عَلَيْكَ الكِتابَ مِنْهُ آياتٌ محكماتٌ... هە تا... وما يَذّكّرُ اِلاّ اولو الالباب) خوێندەوە. پاشان فەرموی ئەی عائشە وەکوو دیتت ئەوانەی کە ئەکەونە شوێن تەئویل و مەعنا لێ دانەوەی ئایەتەکانی (متشابه) بۆ جێبەجێ کردن و ئەدای مەبەستە خراپەکانی خۆیان وەکوو احتجاجی دیانەکان بەئایەتی (روحُ اللّهِ وكلمته). ئایەتی (اِنْ هُوَ اِلاّ عبْدٌ أنعمنا عَلَيْهِ). تەرک دەکەن. ئەمانە خودا ناوی هێناون لەقورئان لە مەقام و شوێنی (ذەم). ئنجا لەمانە خۆتان بپارێزن. (ش): ئایاتی موحکەمە ئەمانەن مەعناو مەبەست لەوان ئاشکرابێ. لە ئەگەرو احتمالاتی اشتباە مەحفوظ و پارێزراوبێ. و مەحکەم کرابێ. (نص و ظاهریش) داخلی موحکەمن.

موتەشابەهیش ئەمەیە تەرەدودو احتمالاتی تیا هەبێ موجمەل و مؤەلیش داخلی موتاشابەهن. پاشان موتەشابەه دوو بەشە (متشابه الالفاظ) هەیە وەکوو پێت و حروفەکانی پچڕاوی سەری سورەتان (متشابه المعانيش) هەیە وەکوو (يد) لە (يد الله فوق ايديهم). یان وەکوو (الرحمن على العَرْش استوى) لە حەدیثیش متشابە هەیە وەکوو لەفظی (ينزل) لە (ينزل ربنا الى سماء الدنيا).

١٠٦٦: عَنْ ابنِ عَباسٍ (ض) لَوْ يُعطى النّاس بَدعواهُمْ لذَهَبَ دِماءُ قَوْمٍ وَأموالُهُمْ. اليمينُ على المدَّعي عليه.

## تەرجەمە

١٠٦٦: دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عەباس (خ.ل) گوتی بیستم لە پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر تەنیا داواکردن و بێ شاهێد (مدعی بە) واتا ئەوەی داوادەکرێ بدرێتە هەر کەسێک لەداواکەران (مودەعیان) چەند خوێن و ماڵی خەڵک و نەتەوە بەخۆڕایی دەڕوا ئەگەر شاهێد نەبوو. سوێند لەسەر ئەوکەسەیە داوای لێ دەکرێ. ئنجا کوڕی عەباس فەرمانی کردووە بە فکر هێناوەو ترساندنی (مدعی علیه) واتا ئەوەی داوای لێ دەکرێ بە ئایەتی (إنَّ الذّينَ يشترونَ بعهدِ اللّهِ وأيمانهِمْ ثمناً قليلاً اولئِكَ لاخلاقَ لَهُمْ في الآخِرَةِ ولا يُكلِمّهُمْ اللّهُ ولاينظرُ اليهِمْ).

یەعنی ئەوانەی سوێند بەدرۆ دەخۆن بۆ ماڵی دونیا ئەوان بێ نەصیب و بێ بەشن لە خۆشی‌یەکان ڕۆژی دوایی (ئاخرەت). ئەگەر تۆبە نەکەن. خودایش قسەیەکی وایان لەگەڵ ناکا. دڵیان پێ خۆش بی وە تەماشاشیان ناکا. یەعنی لەڕقان مویالاتیان پێ ناکا وە بۆ ئەوانیش هەیە عەزابێکی بەئازار.

## فەرموودەی خودا (حَسْبُنا اللهُ ونِعمَ الوكيل)

١٠٦٧: عَنْ ابنِ عَبّاس: قالَ ابراهيمُ عليهِ السّلام هذهِ الآيَةُ حينَ أُلقِيَ في النارِ. وَقالها محمد صَلى الله تعالى عليه وسلم حينَ قالوا إنَّ النّاسَ قد جَمَعوا لكُمْ فاخشَوهُمْ فَزادَهُمْ ايماناً وَقالوا حسبُنا اللّهُ ونِعمَ الوكيل.

## تەرجەمە

١٠٦٧: دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عەباس (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەم ئایەتەی (حسبنا الله ونعِمَ الوكيل). ابراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) خوێندی وەکوو فڕەدرا ناو ئاگر. خودای گەورە ئاگرەکەی بۆ گێڕا بە گولزار وە محمدیش

خوێندی وەکو عورروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی لە غەزای بەدر بۆ ترساندن بە پێغەمبەری گوت. بەڕاستی ئەبو سوفیان بەلەشکرێکی زۆر بۆتان کۆبووینەوە. ئنجا لێیان بترسێن. ئەم قسەی عورروەش باوەڕی و ئیمانی لە ئەصحاب زیادکرد. موبالاتیان بەقسەی نەکرد. گوتیان بەسە بە یاریدەدەرو موعین بۆ ئێمە خودای گەورە وەکیلی باشە بۆ ئێمە ئنجا لە حوسنی نیەتی اسلام بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە. بە دەرەجەیێک موفەق و سەرکەوتووبوون هەتا حەیاتی دونیا کافرەکان چاویان شکاو سەرنگون بوون (ش): لەمە تێ دەگەین کە ئیمان و باوەڕی زیادو کەم دەبی.

١٠٦٨: عَنْ أُسامَةَ (ض) يا سَعْدُ أَلَمْ تَسْمَعْ ماقالَ ابو حُباب. يُريدُ عبداللّه ابنِ أبيِّ قالَ كذا وَكذا. قالَ سَعْدُ ابنُ عبادَةَ يارسول اللهِ اعفُ عَنْهُ فعَفا عَنْهُ.

**فەرموودەی خودای گەورە**

**(ولَتسمَعُنَّ مِنَ الذّينَ أوتو الكتابَ مِنْ قبلكمْ ومِنَ الذينَ أشركوا أذىً كثيراً).**

**تەرجەمە**

١٠٦٨: دەگێڕنەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حارثە (خ.ل) گوتی پێغەمبەر (د) منی لە پشتەخۆی سواری گوێ درێژێکی جل کراو بە قەدیفەی فەدەکیە کرد واتا بەکردارێیکی بەڕیشوە کە لە فەدەک دروستی دەکەن. فەدەک جێگایەکە بەینی لەگەڵ مەدینە دوو قۆناغە بۆ سەر لێدانی سەعدی کوڕی عوبادە لەگەڕەکی بەنی حارثی کوڕی خەزرەج تەشریفی دەفەرموو لەپێش غەزای بەدر بە مەجلیسێکدا ڕەت بوو جووڵەکەو موسولمان و بوت پەرستی تیا بوو عەبدالله کوڕی ئوبەی سەلولی تیا بوو لەپێش بەدیارخستنی ئیسلامەتی خۆی بە نیفاق وەکوو تۆزی وولاخەکەی پێغەمبەر بەسەر مەجلیسەکەدا چوو. عەبدالله کوڕی ئوبەی لووتی خۆی لەبەر تۆز داپۆشی تەشریفی دەفەرموو بۆ گەڕەکی بەنی حارثی کوڕی خەزرەج چونکی سەعدیش خەزرەجی بوو مالیشی لەوێ بوو (ئەم ڕووداوە لەپێش غەزای بەدر بوو) ئنجا کە بە مەجلیسەکەدا ڕەت بوو وەکوو

گوتمان. هەر لەم مەجلیسەدا عبدالله کوڕی ڕەواحەی کوڕی ئەعلەبەی کوڕی امرئ القیسی خەزرەجی تیابوو لەئیسلام. پاشان عبدالله‌ی کوری نوبەی گوتی تۆزمان بەسەر بلآو مەکە. پێغەمبەریش (د) سەلامی کرد بەم تەرزە فەرمووی (السلام علی من اتبع الهدی). پاشان نەختێ بەسواری ڕاوەستا پاشان دابەزی داوای لێ کردن بێنە سەر ئایینی ئیسلام وە قورئانی بۆ خوێندنەوە. پاشان عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول گوتی ئەی پیاو هیچ شتێک باشتر نی‌یە لەمەی کە تۆ دەڵێی ئەگەر حەق بێ. ئنجا ئێمە پێ ئەزیەت مەدە لە مەجلیسەکەی خۆمان. بۆ خۆت بچۆوە قۆناغی خۆت. هەرکەسی هاتەلات قسەی بۆ بکە. عبدالله کوڕی ڕەواحە گوتی ئا ئەی پێغەمبەری خودا گوێ مەدە قسەی عبدالله‌ی کوڕی ئوبەی. هەرکاتێک تەشریف بفەرموو مەجلیسمان وەعظ و ئامۆژگاریمان بکە ئێمە ئامۆژگاری تۆمان پێ خۆشە. پاشان بوت پەرست و جوولەکە لەگەڵ اسلامەکان جنێویان بەیەکتری دا هەتا نزیک بوو لەیەکتری بلند بن بەڵام پێغەمبەر (د) هەر هێمنی دەکردنەوە هەتا سکوتیان کرد وازیان لەقسەکردن هێنا. پاشان سواری گوێ درێژەکەی خۆی بۆوە ڕۆیی. هەتا گەیشتە لای سەعدی کوڕی عوبادە. فەرمووی ئەی سەعد تۆ گوێت لەقسەی ئەبو حیباب نەبووە (مەبەستی عبدالله‌ی کوڕی ئوبەی بوو) ووهاو وها دەڵێ. سەعد گوتی ئەی پێغەمبەری خودا عەفووی بفەرموو چاوی لێ بپۆشە. سوێندم بەو زاتەی کە کتابی بۆتۆ ناردە خوارێ. خودا هات بەحەقێکی کە هەناردی‌یە خوارێ بۆ سەرتۆ سەبەبی انکاری عبدالله‌ی کوڕی ئوبەیش ئەمەیە. خەڵکی مەدینە ڕێک کەوتبوون تاجێکی لەسەر بنێن و عەمامەیەکی شاهانەشی لەسەر ببەستن وە بیکەن بە سەرۆکی خۆیان پاشان وەکوو خودای گەورە ئەمەی لێ مەنع کرد بەسەبەب حەقێک کە بەتۆی کەرەم کردو بەخشی. دڵی ڕەق و تەنگ بوو. ئنجا پێغەمبەر (د) عەفووی فەرموو چاوپۆشی لێ کرد. چونکی حالی وابوو لەگەڵ ئەصحابی خۆی چاوپۆشین و عەفوویان زۆر بوو لەبەرامبەر ئەزیەت و عەزابی بوت پەرست و جولەکەو دیان لەپیش هاتنەخوارەوەی ئیزن بەجیهاد. ئنجا پێغەمبەر (د) وەکوو غەزای بەدری کرد. زۆر لەگەورەکانی کافری قورەیش کوژران عبدالله کوڕی ئوبەی بەبوت پەرستەکانی گوت. ئەم ئیشەی محمد لەسەرە ئەوا بەدیارکەوت ئنجا بەیعەتی پێ بکەن لەسەر ئایینی ئیسلام. موسولمان بوون.

**بەرگی هەشتەم تەواو بوو.**

**چاوەڕێی بەرگی نۆیەم بن لەم پەرتووکە بەهیوای یەزدانی پاک بەم زووانە چاپی دەکەین‌و دەی خەینە بەردەستی خوێنەرانی خۆشەویست.**